The first Magazin Especializined in Management and Human Development in Kurdistan

مانگانەیەکی تایبەتە بە کارگێڕی و گەشەپێدانی مرۆیی
ساڵی دووەم – ژمارە 23 – نیسانی 2010

بەڕێوەبەری نووسین
بەرزان ئەبوبەکر

سکرتێری نووسین
ئەسکەندەر رەحیم

ب: پەیوەندییەکان
محەمەد هاشم

دەستەی نووسەران
هاژە شێروانی
پەیمان بەرزنجی
بێگەرد فارس
پەری شێخ کەریم
وەهاب حەسیب
محەمەد مێرگەیی

راوێژکاری یاسایی
پارێزەر: ئازاد محێدین

دیزاین
جەمال دەروێش
پشتیوان عەبدوڕەحمان

بەشی ڕیکلام
07480112787

حساب بانکی گۆڤار
بانکی کوردستانی نێودەوڵەتی سلێمانی 3371

خاوەنی ئیمتیاز
ئەندازیار مەسعود تاهیر ڕۆژبەیانی

سەرنووسەر
عادل محەمەد شێخانی
sarnosar@yahoo.com

بۆ دابەشکردنی بڕیار

هەولێر: خانەی سیروان ٠٧٥٠٤٦٧٢٩٦٣
کەرکوك: ٠٧٧٠٨٥٦٣٧٢٤ هەڵەبجە: ٠٧٧٠١٩٣٣٩٦٧ –٠٧٥٠١١٢٩٤٢٧ دەربەندیخان:
٠٧٧٠١٥٨١٠١٨ کفری: ٠٧٧٠١٥٦٦٨٧٦ کەلار: ٠٧٧٠٢١٠١٢٨٨
چەمچەماڵ: ٠٧٧٠٨٥٥٠٥٨٦ کۆیە: ٠٧٧٠١٥٤٩٧١٤ سۆران: ٠٧٥٠٤٥٠١٩٣٣
چۆمان: ٠٧٥٠٤٥٦٧٩٩٢ قەڵادزێ: ٠٧٧٠١٥٨٥٢٠١ ڕانیە: ٠٧٧٠١٥٨٠٤٤٢

ناونیشانی گۆڤار

سلێمانی - شەقامی سالم -تەلاری سلێمانی مۆڵ- نهۆمی دووەم
بەرامبەر بەڕێوەبەرایەتی گشتی پەروەردە
٠٧٧٠٢١٧٨٦٨٢ ٣١٩٣٩٤٦
E-mail: bryarmagazin@gmail.com
هەولێر ٠٧٥٠٧٦٥٨٥٣٥ ٠٧٥٠٤٤٦٣٢٣٠

تیراژ: 3000 دانە

چاپخانەی سەردەم

شەوان کاتێك دەگەڕێتەوە منداڵەکان خەوتوون، بەیانیش کاتێك دەڕوات هێشتا ئەوان لە خەودان!

ناتوانین سەردانی کەس بکەین!

کاتێکمان نییە بۆ دانیشتنو گفتوگۆ!

چەندین شەو هەستمان بە هاتنەوەو ڕۆیشتنی نەکردووە!

هەمیشە دەڵێت: سەرقاڵم، کارم زۆرە پێ ڕاناگەم!

بە دوو سێ مۆبایل قسە دەکات!

تاقەتی قسەکردنی نییە لەگەڵ ئێمەدا، زوو تورە دەبێت.

ئەمانەو چەندین گازندەی تر لەو کەسانەی کە ئالودە بوون.

**ئالوودەبوون چییە؟**

ئالوودە بە کارکردن:

لە بواری کارگێڕیدا (ئالودە بوون) لە خراپترین جۆرەکانی ئالوودەبوونە، کە وای لێ دێت بەڕێوەبەر یا کارمەند ئالودەی کار دەبێتو ئیدمان دروست دەکاتو وای لێ دێت هەموو ژیانی دەبێتە کارەکەیو ئیتر خۆیو دەوروبەر لە بیر دەکات.

ئێمە بۆیە کار دەکەین بۆئەوەی ئاسوودە بین نەك ئالوودە!

دڵخۆش بین نەك هەمیشە سەر قاڵو گرفتار!

خۆمان خاوەنی هەموو شتێکینو نهێنی سەرکەوتنمان خودی خۆمانە نەك وامان لێ بێت نرخی خۆمان تەنها لە کارەکەماندا بدۆزینەوە!

تەنها کاتێك لەو دیوی مێزی کارگێڕییەوە دانیشتووین هەست بە بوونی خۆمان بکەین.

هۆکارەکانی ئالوودە بوون زۆرن لەوانە:

گرفتی خێزانیو ڕاکردن لێی، گرفتی تایبەت کە وا دەکات ئارەزووی کەنارگیریو دوورکەوتنەوە بکات.

ترس لە ئاینده، رابردوویەکی تاڵ کە دەیەوێت قەرەبووی بکاتەوە بە گەیشتن بە پلەیەکی بەرزی کارگێڕی.

گومان بردن بەوەی کە دەتوانێت بەو ئالوودە بوونو ئیدمانە زوو بە پێ پلیکانەی کارگێڕیدا سەربکەوێتو پۆستی بەرز بە دەست بهێنێت.

زیادەڕۆییو ڕۆچوون لە خۆشەویستی کاردا.

هەر کاتێکیش پێیان بڵێین: براله ئەمە وانابێت ئێوە خۆتان لە هەموو شتێك مەحروم کردووە!

نە خەوتان ماوە نە خۆراك، نە پەیوەندی کۆمەڵایەتی!

لە وەڵامدا دەڵێن: ئەمە کارێکی کاتییەو تەنها بۆ چەند مانگێکەو دوای تەواوبوونی کارەکان دێمەوە دۆخی ئاسایی خۆم، بەڵام ئەم بەڵێنە درێژە دەکێشێتو ئیدمان هەر بەردەوامەو کارەکانیش هەرگیز تەواو نابن!

تا ژیان مابێت کار تەواو نابێت، ئەم بەڵێنە تەنها دەتوانرێت لەسەر پەڕەی ڕووبارەکان واژۆ بکرێت.

ئالوودەبوونی شوێنەواری زۆر نێگەتیڤی هەیە لەسەر ئاستی تەندروستیو دەروونیو کۆمەڵایەتی، دەبێتە مایەی لە دەستدانی پێگەی کۆمەڵایەتیو تووشبوون بە زۆربەی نەخۆشییە دەروونییەکان، وێڕای بەرزبوونەوەی پاڵەپەستۆی خوێنو شەکرەو تورەییو لاوازیو.... هتد.

ئامارەکان ئاماژە بە ژمارەی تۆقێنەر دەکەن:

ئەوەتا وەزارەتی تەندروستی ژاپۆنی رایدەگەیەنێت کە لە ماوەی ساڵێکدا (٣٥٥) کارمەند تووشی نەخۆشی ترسناك بوون بە هۆی ئالوودەبوونی کارەوە، لە وانەش (١٤٧) کەسیان گیانیان لە دەستداوە لە ئەنجامی تووشبوونیان بە وەستانی مێشكو گرفتەکانی دڵەوە، کە هەموویان هۆکارەکەیان بۆ زیادەڕۆییان لە کاردا دەگەڕێتەوە، هاوکات راپۆرتەکەیان رایدەگەیەنێت کە لە (٨١٩) کارمەند (٢٠٥) کەسیان تووشی شێتیو لە دەستدانی ژیری بوون، بە هۆی ئەم کارەشەوە (١٧٦) کەسیان خۆیان کوشتووە.

لە لێکۆڵینەوەیەکدا لە سەنگافورە کە (١٦٠١) کەسی گرتبۆوە دەرکەوتووە کە ئالوودەبوون بە کارەوە دەبێتە مایەی لە دەستدانی توانای ژیریو دابەزینی هۆشو بیرو مرۆڤ دەکاتە کەسێکی نا هەستیار.

خۆشەویستان کار پیرۆزەو کارکردن جێگای ڕێزە، بەڵام کار هۆکارە بۆ ژیانو گوزەرانو خۆشبەختی نەك کۆیلایەتیو لە دەستدانی هەموو خۆشییەکانی ژیان، زۆرجار کاتێك کەسانێك دەبینم شەوو ڕۆژ سەرقاڵی کاروباری بازرگانیو جەمکردنی پوڵو سامانن وەکو مرۆڤە ئاساییەکانیش ناتوانن بخۆنو بخۆنەوەو کەیفو خۆشی خۆیان وەرگرن.

بەزەییم پێیاندا دێتەوەو سەرم لەو کارەیان سوڕ دەمێنێو دەپرسم ئەمانە خەریکی چینو بۆچی وا لە خۆیان دەکەن؟

کەواتە با کارکردن بەشێك بێت لە ژیانمان، نەك ژیان بەشێکی بچووك بێت لە کارکردن.

# کارگێڕی به گوفتار

مۆمێکی بچکۆلانە دابگیرسێنیت، باشترە لەوەی کە هەموو تەمەنت لە نەفرەتکردنی تاریکیدا بە فیڕۆ بدەیت!

بەهێز ئەو کەســە نییە کە هەمیشە لە جەنگدا سەردەکەوێت، بەڵام بێ هێز ئەو کەسەیە کە هەمیشە ئاشتی دەدۆڕێنێت.

نازناوی گەورە تەنها مەدالیایە بۆ ســنگی گەمژەکان، چونکە پیاوە مەزنەکان جگە لە ناوی خۆیان پێویستیان بە هیچ نییە!

گەورەیی عەقڵت کەسانی حەســوودت بۆ دروست دەکەن، گەورەیی دڵت دۆستو هاوڕێ!

ئەوەی درەختێکی خۆش بوویت، دەبێت لقەکانیشی خۆش بوویت.

وشەی جوان پاسپۆرتێکە بۆ نێو هەموو دڵەکان!

ویژدانی دڵنیا، باشترین سەرینە بۆ پشوو!

# کارگێڕی بە چیرۆك

## پاراستنی کەلەپوور گرنگە بەڵام...!

دەگێڕنەوە کابرایەك کە باوکی سێ کوڕ بوو، دوای مردنی خۆی لەو شتانەی کە بۆی بەجێ هێشتبوون، کاڵەکێکی جوان بوو، براکانیش زۆر ڕێزی ئەو کاڵەکەیان دەگرتو شانازییان پێوە دەکردو بە کەلەپوری باوکیان دەزانیو ڕێگایان نەدا کەسێك بە تەنها ببێتە خاوەنیو لە شوێنێکی باشی ماڵەکەدا هەڵیان گرتو پارێزگارییان لێ کرد!!

بەڵام بە تێپەڕبوونی کات کاڵەکەکە تێکچوو، بۆنێکی ناخۆشی بە ماڵەکەدا بڵاوکردەوەو هەمووانی هەراسان کرد!

براکان دانیشتن بۆ چارەسەری ئەو کێشەیەو دۆزینەوەی ڕێگەچارەیەك.

یەکەمیان گوتی: پێویستە وێڕای تێکچوونی کاڵەکەکەش هەر پارێزگاری لێ بکەین، با بۆنی بۆگەنیش هەراسانمان بکات، چونکە کەلەپوری باوکمانەو نابێت دەستبەرداری بین!

دووەم گوتی: لە کاتێکدا بارودۆخی ئەو کاڵەکە ئاوای لێهاتووە، جێگای شەرمەزارییە بەم شێوەیە پارێزگاری لێ بکەین، کەواتە با کەڵێکی نوێ لە شێوەی ئەو بکڕینو لە شوێنی ئەوی دابنێینو بەو کارەش هەمیشە باوکمان دێنێتەوە یاد، چونکە کاڵەکەکە هاونموونەی کاڵەکی یەکەمە.

بەڵام سێیەمیان گوتی: ڕای من پێچەوانەی ئێوەیە، من پێشنیار دەکەم کاڵەکەکە بشکێنینو تۆوەکەی ناوی دەرکەینو لە کێڵگەکەماندا تۆوی بکەین پێش ئەوەی ئەویش خراپ ببێت، بەو کارەمان کاڵەکێکی زۆر بەرهەم دەهێنینو هەموو ئەو کاڵەکانەش باوکمان بیر دەخەنەوە.

لە نێوان سێ براکەدا بوو بە دەنگە دەنگو هەرا، تا دەنگیان گەیشتە کۆڵانو دەرودراوسێو دۆستو برادەر پێیان زانیو ئەوانیش بۆ چارەسەری کێشەکە هاتنە پێشەوە، دوای گفتوگۆیەکی زۆر هەموویان ڕای سێیەمیان پەسەند کردو کاڵەکەکەیان شکاندو تۆوەکەیان دەرهێناو لە کێڵگەکەیاندا تۆویان کردو پاش ماوەیەك ماڵەکەیان پڕ بوو لە کاڵەکی خۆشو بە تام!

لەم چیرۆکەوە فێر دەبین:

١- پاراستنی کەلەپور کارێکی گرنگەو مایەی ژیانو زیندوویی گەلو نەتەوەیە، بەڵام نەك بە شێوەیەکی کوێرانە.

٢- کەلەپور پێویستە سوودی لێ وەربگیرێتو بە پێی ڕۆژگار کانیاوی بیری نوێ بێت، نەك ببێتە سەرچاوەی کۆنەپەرستی.

٣- پێویستە هەموو گەلێك ڕابردووی خۆی بپارێزێت، چونکە ئەوەی ڕابردووی خۆی نەزانێت ناتوانێت نەخشە بۆ ئایندەی دابنێت.

٤- هەر سەردەمەو بارودۆخی خۆی هەیەو پێویستی بە بیری نوێو کەسانی نوێخوازو تێگەیشتوو هەیە.

٥- کەسانی دەق بەستوو چەقیو ناتوانن سوود لە کەلەپورو مێژوو وەربگرن.

٦- بە گفتوگۆو ڕاگۆڕینەوە دەتوانین بگەینە بۆچوونی بەسوودو کەڵکی بۆ هەموومان هەبێت.

٧- هەموو بیرو بنەمایەك ئەگەر سوودی لێ وەرنەگیرێتو جارێکی تر نەخرێتە ژێر باسولێکۆڵینەوەوە دەکرێت وەکو کاڵەکەکە بۆگەن بێتو تێك بچێت.

# سەرەتایەك لە زانستی ڕێکخستن

بەشی دوانزەیەم

هاژە شێروانی

### شێوەکانی هەرەم/ پەیکەربەندی ڕێکخستن:

لێرەدا پەرەپێدانی سروشتی ڕێکخراوەکان (بەواتای سەرهەڵدانو بەرزبوونەوە لە ڕێکخستن) دەبێتە هۆی سەرهەڵدانی شێوەکانی پەیکەربەندی ڕێکخستن بە سیمایەك کە لە ژمارەکانی (٢١و٢٢)دا ئاماژەمان پێکرد، ئەم سیمایانەش بریتی بوون لە یەکەکانی ڕێکخستن، ئاستەکانی ڕێکخستن، یەکە پاڵپشتەکان (کارگێڕیو هونەری)، ئەرکو چالاکی ڕێکخستن)، سەرەڕای بوونی ئەم سیمایانەی ڕێکخستن بەلأم شێوەی کۆتایی ڕێکخستن هەر دیاری دەکرێت بە گوێرەی قەبارەی کارەکانو ژمارەی کرێکارەکان، سروشتی چالاکی، سروشتی بارودۆخی دەوروبەری ڕێکخراو، ڕاو ئارەزووی خاوەندارانی ڕێکخراوەکانو کارگێڕی باڵا تیایدا.

هەر ئەم فاکتەرانەن کە بەشداری دەکەن لە دیاریکردنی شێوە کۆتاییەکەی پەیکەربەند، هەر بۆیە پێشبینی دەکەین کە گەلێك شێوەی پەیکەربەندی ڕێکخستنمان هەبێت کە شەش پەیکەربەندی سەرەکین، وەکو:

### یەکەم/ پەیکەربەندی سادە: Simple Structure

کاتێك کە ڕێکخراو سادە بێت، پەیکەر بەندی سادە بۆی گونجاوە، بۆ ڕوونکردنەوەشی دەتوانین بڵێین کە ڕێکخراوی بچووکە لە قەبارەو تەمەن، لەوانەی کە لە قۆناغی سەرهەڵداندا بێت، کاتێك کە ژینگە سادە بێت (بە واتای توخمەکانی دیاریکراو دەبنو هەموو داتاکانیان تیابەدی دەکرێت)، لەم کاتەدا خاوەنداری ڕێکخراو بەڕێوەبەرەکەیەتی کە بیەوێت دەسەڵاتی بسەپێنێت (بە شێوەی مەرکەزی) دەبینین کە پەیکەربەندی سادە بۆی گونجاوە.

پەیکەر بەندی سادەش ئەوەیە کە ژمارەی یەکەکانی ڕێکخستن (بەشو کارگێڕییەکان) زۆر کەمو دیاریکراون، هەروەك ژمارەی ئاستەکانی ڕێکخستن هەر دیاریکراون (بۆ یەك ئاست یان تەنها دوو ئاست)، ئەمەش لە بەرئەوەی ژمارەی کرێکارەکانی زۆر کەمن، پەیکەربەند تەنها تیشکی خستۆتە سەر پرۆسە سەرەکییەکانو چالاکییە گرنگەکانی ڕێکخراو، زۆر جاریش تەنها تیشك دەخاتە سەر پرۆسەکانی بەرهەمهێنانی (پێشکەشکردنی خزمەت) لە پاڵ پرۆسەکانی فرۆشتنو لە گرنگترین نموونەی ئەو پرۆژانەی کە پەیڕەوی ئەم پەیکەربەندە سادەیە دەکات فرۆشگا بچووکەکان، سەوزەفرۆش، کارگەی بچووك، نووسینگەی خزمەتگوزاری بچووكوەکو نووسینگەکانی ژمێریاریو ڕاوێژکاری، کۆمپانیاکانی بەڵێندەرایەتی بچووك... هتد.

لە گرنگترین ناسینەوەکانی ئەم شێوە پەیکەربەندانەش ئەمانەن:

١- سادەیی: چونکە پەیکەربەندی بچووك کارایەو تەنها تیشك دەخاتە سەر پرۆسە گرنگەکان.

٢- نەرمو نیانی: تواناداره لەسەر گونجانی لەگەڵ بارزودۆخ بە خێرایی.

هەرچی خەوشەکانییەتی ئەمانەن:

١- ناگونجێت بۆ ڕێکخراوێك کە کارەکانی گەورەو فراوان بێت.

٢- پشت بەستنی بە خاوەنی پرۆژەکە بە تەواوی، چونکە لەوانەیە تەندروستیو میزاجی کاریگەری بخەنەسەر کارگێڕی، هەروەك دەسەڵاتیشی بە تەواوی لە دەست ئەودایە.

### دووەم/ پەیکەربەندی بیرۆکراسی میکانیکی/ کارەکان: Machine Bureaucracy Structure

لێرەدا ڕێکخراو گەلێك هەن کە بە بچووکی دروست دەبنو لە گەشەکردنیاندا ئاراستەکەیان بەرەو پەیکەربەندی بیرۆکراسی میکانیکی دەڕوات، لە هەمان کاتیشدا ڕێکخراوی تر هەن کە هەر لە سەرەتای سەرهەڵدانیاندا خاوەن پەیکەربەندێکی بیرۆکراسی میکانیکین، کارو چالاکییەکانی ئەم جۆرە پەیکەربەندە لە ڕێکخراودا بەوە دەناسرێتەوە کە

ئاستی ڕۆتینی واتا دووبارە بوونەوەی کارەکانی زۆرە، ڕێوشوێن‌و یاساو سیاسەتی کارکردنیشی فەرمییە، لەگەڵ بوونی مەرکەزییەت تیایدا، بڕیارەکانیشی دەردەکرێت‌و بە ڕێ دەکرێت لە ڕێگای گرتنەبەری ڕێوشوێنی فەرمی کە لە ئاستەکانی ڕێکخستندا ئاماژەی پێ دەکرێت، هەروەك یەکەکانی ڕێکخستن‌و کارەکانی جیادەکرێتەوە بەوەسفکردنێکی ورد بۆی کە گوزارشت لە جۆری ناسینەوەی‌و جیاکردنەوەی بەهێزی، هەروەك جیاواز ڕوونیشی لە نێوان چالاکییە جێبەجێکاری‌و ڕاوێژکارییەکان بەدی دەکات.

ئەو بارودۆخەی کە دەوری پەیکەربەندی بیرۆکراسی میکانیکی دەدات ئاماژەیە بۆئەوەی کە ڕێکخستنەکەیان قەبارە مامناوەندە یان قەبارە گەورەیەو خاوەن تەمەنێکی گەورەشە (کە ڕێگە بە گەشەسەندنی بیرۆکراسی بدات کەم کەمە)، هەروەك تەکنەلۆژیاکەشی بەوە دەناسرێتەوە کە ڕۆتینییەو ناگۆڕێت، هەرچی ژینگەکەیەتی سەقامگیرەو جۆرێك لە دڵنیایی‌و کۆنترۆڵکردنی تێدایە، ئەم بارودۆخەشە کە ڕێگە دەدات بە بەکارهێنانی سیستەمێکی ئاست بەرز لە ڕۆتینی‌و یەك ڕێچکەیی‌و فەرمی بوون.

لێرەدا پەیکەربەندی بیرۆکراسی میکانیکی پەیڕەوی شێوەی کارەکان دەکات (یان یەکێك لە شێوە تەقلیدییەکانی پەیکەربەند: جوگرافی، بە گوێرەی پرۆسەکان، ئامێرەکان، بە گوێرەی کڕیارەکانە)، بۆ یەکەم جاریش لەم جۆرە پەیکەربەندانە یەکەی پاڵپشتی هونەری دەردەکەون وەك یەکەکانی پلانی ستراتیژی‌و توێژینەوەی کارو ڕێکخستن، سیستەمی زانیاری، لەگەڵ سەرهەڵدانی یەکە پاڵپشتە کارگێڕییەکان (یان ڕاوێژکارییەکان) وەك یەکەی پەیوەندی گشتی، کاروباری یاسایی.

لە گرنگترین ئەو ڕێکخراوانەی کە پەیڕەوی هەرەمی پەیکەربەندی بیرۆکراسی میکانیکی دەکات بریتین لە ڕێکخراوە حکومییەکان‌و وەزارەتەکان‌و دەستەی پۆستەو باج‌و گومرگ‌و کۆمپانیاکانی دڵنیایی‌و بانکەکان‌و گەیاندن‌و ئاگرکوژێنەوەو کۆمپانیای فڕۆکەوانی‌و پیشەسازی‌و بازرگانی گەورە.

هەروەك گەورەیی قەبارەی ڕێکخراوو چالاکی‌و ژینگە سەقامگیرەکەی هاندەرە لەسەر بەکارهێنانی پەیکەربەندی بیرۆکراسی میکانیکی، لە ناسینەوەکانیشی بریتین لە:

١- ڕاپەراندنی چالاکییەکانی ڕێکخراو بە توانستی بە هۆی بوونی سیستەمی نەرمی یەك ڕێچکەیی کە ئەدای کارکردن بە توانستی دەگرێتەوە.

٢- پسپۆڕی‌و توانای دابەشکردنی کارو زامنی بەکارهێنانی کارمەندی کارزان‌و مەشق پێکراو.

٣- توانای پەرەپێدانی سەرچاوەی مرۆیی لە ڕێکخراودا لە کارە پسپۆڕە ناسراوەکانیدا.

٤- دەستەبەرکردنی ئابوورییەکانی قەبارەی گەورە بە جۆرێك کە قەبارەی گەورەی ڕێکخراوو چالاکییەکەی گێڕانەوەیەکی گەورە دەستەبەر دەکات لە تێچوون.

هەرچی سەبارەت بە خەوشەکانییەتی بریتین لە:

١- پسپۆڕی‌و دابەشکردنی کار دەبێتە هۆی ناسینەوەی ڕێکخستن لەگەڵ توانای سەرهەڵدانی ململانێ‌و لە یەك کردنەوەی نێوان یەکەکانی ڕێکخستن.

٢- سەرهەڵدانی دیاردەی زیادەڕۆیی کردن لە بەکارهێنانی سیستەم‌و ڕێنماییەکان‌و پێداگری لە سەر پیادەکردن‌و هەندێك جاریش وەستاندنی کارەکان.

### سێیەم/ پەیکەربەندی بیرۆکراسی پیشەیی/ کارەکان: Professional Bureaucracy Structure

لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم ڕێکخراوی قەبارە گەورە سەری هەڵدا، کە خاوەن پسپۆڕی پیشەیی گەورەن‌و پێویستیان بە پسپۆڕی خاوەن ئاستێکی فێرکردنی بەرزو مەشق پێکراوی پێشکەوتوون‌و لەوانەیە مۆڵەتی پیشەیی دیاریکراو کە جۆرێك لە سەربەستییەکی گەورە دەدات لەگەڵ پێدانی دەسەڵات بۆ ئەم پیشانە بۆ بە ئەنجام گەیاندنی کارەکانیان، سیمای ئەم کارەش لامەرکەزییەو لە دواییدا پەیکەربەندەکەش، پەیکەربەندی بیرۆکراسی لامەرکەزی دەبێت، لە نموونەی ئەم جۆرە ڕێکخراوانە کە پەیڕەوی ئەم جۆرە پەیکەرانە (هەرەمانە) دەکەن: نەخۆشخانەکان، زانکۆکان، پەیمانگە تایبەتەکان، کتێبخانە گشتییەکان، کۆمپانیای کۆمپیوتەر، کۆمپانیاکانی سیستەمی زانیاری، دارایی گەورەو ڕاوێژکاری کارگێڕی‌و دارایی‌و ژمێریاری گەورە.

لە گرنگترین ناسینەوەو خەوشەکانی کە ئەم جۆرە پەیکەربەندە دەستەبەری دەکات تارادەیەك هاوشێوەی جۆری دووەمە کە بریتییە لە هەرەمی بیرۆکراسی میکانیکی.

# لێهاتوویی بەر لە ئەرکسپاردن

و/ ئەسکەندەر ڕەحیم

گومانی تێدا نییە کە ئەرکسپاردن بە لێهاتووی‌و ڕێوشوێنە گرنگەکانی کاری هەر بەڕێوەبەرێك لە قەڵەم دەدرێ.

پرسیاری گرنگ لێرەدا ئەوەیە: چۆن بە کاری ئەرکسپاردن هەڵدەستیت؟

بە وردی سەرنج لەم نۆ پرسیارەی خوارەوە بدە، بە «بەڵێ» یاخود «نەخێر» وەڵامیان بدەرەوە.. بۆئەوەی ببینیت تا چ ئەندازەیەك پێویستیت بە ئەرکسپاردن هەیە:

١- ئایا بۆ ئەنجام گەیاندنی ئەو کارەی لێت داواکراوە، پێویستیت بە چەند کاتژمێرێکی زۆرترە؟

٢- کاتێك ئەرکێك بە کارمەندێك دەسپێریت.. تا ڕایبپەڕێنێت، ئایا پێی دەڵێیت: «بەم جۆرە ئەنجامی بدە»؟

٣- ئایا لە پشووی هەفتەدا یان لە گەڕانەوەت بۆ ماڵەوە.. پاشماوەی کارەکانت دەبەیتەوەو شەونخوونی لەگەڵدا دەکێشیت تا بەتەواوی ئەنجامی بدەیت؟

٤- ئایا لەبەر نەبوونی کاتی تەواو، ناچار بە پەسەند نەکردنی گەڵاڵەو پرۆژەیەکی نوێ دەبیت؟

٥- ئەو کارمەندانەی ئەرکەکانیان پێ سپێردراوە، ئایا لێیان ڕادەبینیت، بەو جۆرەی چاوەڕێ دەکەیت.. ڕایانبپەڕێنن؟

٦- ئایا کارمەندەکانت بە دەست بێ ورەو وزەییەوە.. تاڵ‌و سوێری دەچێژن؟

٧- ئایا کارمەندەکانت بە دەگمەن بیرۆکەو پیشنیازی باش.. دەخەنە ڕوو؟

٨- لەو بەشەی تۆ سەرۆکایەتی دەکەیت.. ئایا هەر تۆیت هەموو بڕیارەکان دەدەیت؟

٩- ئایا لە نەبوونی تۆدا.. کارەکە دوا دەکەوێت‌و پەکی دەکەوێت؟

ئەگەر لەو پرسیارانەی سەرەوە.. پێنج پرسیاریان یان زۆرتر وەڵامەکەت «بەڵێ» بوو.. ئەوا تۆ بە شێوەیەکی چڕو پڕتر، پێویستت بە جێبەجێکردنی ئەرکسپاردنە.

سەرچاوە: النخبة الإدارية.

# بەڕێوەبەرە ئۆکتۆپۆسییەکان

و: ئاری علی هەڵەبجەیی

هێشتا کەسانێك هەن کە بەڕاستی باوەڕیان وایە کە ئەگەر بتەوێ کارێك بە باشی ئەنجام بدەیت واباشترە کە خۆت جێبەجێی بکەیت، ئەو کەسانەی کە باوەڕیان بەمە هەیە زۆر بە دەگمەن ڕێدەکەوێت کە ببن بە بەڕێوەبەرێکی باشو لێهاتوو، چونکە لە ڕووی ڕاسپاردنو پێدانی بەرپرسیاریەتییەکان بە ژێردەستەکانیان زۆرجار توشی کێشە دەبنەوە، ئێمە لەوانەیە لە ژیانی ڕۆژانەماندا نموونەی ئەو کەسانەمان بینیبێت، ئەو کەسانە بە سروشتی خۆیان تەنها ئەو کارە ئاسانانە دەسپێرن بە ژێردەستەکانیان کە هەموو کەسێکی بێ ئەزموون توانای جێبەجێکردنی هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆیان بە تەنها ڕووبەڕووی کارە گرنگو گرانەکان دەبنەوە، بۆیە لە ئەنجامدا شەوو ڕۆژ خەریکی کارکردن دەبن، تەنانەت بەشێك لەو کارانەی کە تەواو نەبوون دەیباتەوە لە ماڵەوە ئەنجامی دەدات، ئەو کەسانەی کە ئەم کارە بۆتە بەشێك لە کاری ڕۆژانەیان ئەوانە بەڕێوەبەرێکی ناشایستەن، نازانن کە چۆن ڕاهێنان بە ژێردەستەکانیان بکەن بە شێوەیەکی گونجاو، هەروەها تووشی چەندەها کێشەی وەکو دەست لە کارکێشانەوەو داواکردنی بە خانەنشین بوونو داواکردنی گواستنەوەی بۆ جێگایەکی کارکردنی تر دەبنەوە. فەرمانبەرە ژێردەستەکان شایانی لەوە زیاترن کە بەڕێز بەڕێوەبەری ئۆکتۆپۆسی بیری لێ دەکاتەوە، بۆیە زۆر زوو لە جێبەجێکردنی ئەو کارە ئاسانانەدا ماندوو دەبن. زۆر جاریش ئەو فەرمانبەرانەی کە لەگەڵ ئەم جۆرە بەڕێوەبەرانەدا کار دەکەن لە کاتی کارکردن تووشی کێشەی وەك بەرزبوونەوەی پلە (ترقیە) دەبنەوە، هەروەها لەبەرئەوەی کە بوارێکی وەهایان پێ نادرێت کە تواناو لێهاتووییەکانیان بسەلمێنن بۆیە زۆر بە کەمی چاوەڕوانی بەرزبوونەوەی پلەیان دەکەن، ئەمجۆرە بەڕێوەبەرانە باوەڕیان بەوە نییە کە ڕێگرتن لە پێدانی بەرپرسیاریەتییەکان بە فەرمانبەرەکان ببێتە هۆی لاوازی هێزی بەڕێوەبەرایەتی کردن، ئەو کەسانەی کە ئۆکتۆپۆسین هیچ کات نابێت پلەی بەڕێوەبەریان پێ بدرێت، لەبەرئەوەی کاتێك کە دەبنە بەڕێوەبەر دەبنە هۆی ڕق لێبوونەوەیان لە لایەن فەرمانبەرەکانەوە، بەم شێوەیە ڕێگا لە بەرز بونەوەی پلەیان دەبەسترێت بۆیە دەبێت لە بیرتان بێت کە ئەگەر پلەی بەڕێوەبەرتان وەرگرت نەکەونە ئەم داوەوە، چونکە ئەگەر شێوازی ئۆکتۆپۆسی بگرنەبەر لەوانەیە لەسەر کۆتا پلەی بەرزبونەوەتاندا بووەستن، نەتوانن کە لەوە زیاتر بەرز ببنەوە، مەگەر ئەوەی کە بەڕێوەبەرەکانی سەرەوەی فەرمانگەکەی ئێوەش لە بەڕێوەبەرە ئۆکتۆپۆسەکان بن، بەم شێوەیە هەموو پێگەوپێکهێنو پێکهاتووەکانی ناو فەرمانگەکە دووچاری کێشەی سەرەکی دەبنەوە، لەوانەیە بەڕێوەبەری سەرەوەو بەڕێوەبەرەکانی تریش، بە هۆی کاری زۆرەوە ژیانێکی خۆش نەبەنەسەرو تەمەنیان کورت بێت. یەکێکی تر لە تایبەتمەندییەکانی بەڕێوەبەرە ئۆکتۆپۆسیەکان ئەوەیە کە زۆر بەکەمی پشووی ماوە درێژ وەردەگرن، ئەوانە دوای چەند ماوەیەك لە کارکردن ڕۆژێك یان دوو ڕۆژ پشوو وەردەگرن، چونکە بە پێچەوانەی ئەمەوە بە هۆی پابەندبوونی لە ڕادەبەدەری ئەو دەزگاو فەرمانگەیەی کە لە ژێر دەستی ئەم بەڕێوەبەرانەدایە لە کاتی کارکردندا تووشی کۆسپو تەگەرە دەبنەوە.

«Octopus»: گیانەوەرێکی ئاوییە کە پێی دەڵێن هەشت پێ (ئەختەبوت) یان شەیتانە ماسی.

سەرچاوە: سایتی (مدیران اینده).

# پەرۆشیو خەمخۆری کارگێڕیی

نووسینی: د. طارق السویدان

و: دڵشاد موحەممەد

بەرپرسو خاوەن لێپرسراوێتی جا لە هەر کارێکدا بێت، خۆی خاوەنی بێت یان فەرمانبەر بێت تێیدا، بچووك بێت یان گەورە، ئەوا هەست بە لێپرسراوێتی دەکات ئەگەر هاتوو دڵسۆزو ڕاستگۆو سەرڕاستو ئەمینداربوو، چونکە ئەو بەرپرسە لەو کارە بەرامبەر کەسانی لە خۆی باڵاترو بەرامبەر جەماوەرو کڕیارەکانی، لەوەش گرنگتر لە کارەکەی بەرپرسە لە بەرامبەر خوای گەورەو باڵادەست.

ئەگەر ئەو بەرپرسە لە هەستو نەستی خۆیدا ڕاستیکردو دڵسۆز بوو بۆ دینو خوداو پرەنسیپەکانی خۆی، ئەوا نەك تەنها خەمو پەرۆشییەك بگرە چەندین خەمو پەرۆشی هەیە، پەرۆشیو خەمخۆری بەرپرسیش خۆی دەبینێتەوە لە:

* بیرکردنەوەی بەردەوام لە کەمتەرخەمی نەکردنو ئەنجامدانی کارەکەی بە باشترین شێوە.
* ئەمەکداریو بەوەفابوون بە ئەرکو پابەندییەکانی بەرامبەر خەڵکی لە ناوەوەو دەرەوەی کارەکەی.
* خەمخۆری لە ڕێکخستنی داراییو بە فیڕۆنەدانیو زێدەڕەوی نەکردن تێیدا.
* گەڕان بە دوای بیرۆکەو ڕێگەو شێوازو هۆکاری جۆراوجۆر بۆ بەرەوپێشبردنو باشترکردنو فراوانکردنی کارەکە.
* ڕێکخستنو ڕێکوپێککردنی بواری کارگێڕیی بۆ بەرگرتن لە بێسەروبەری لە کارو فەراموشکردنو پشتگوێخستنو جێهێشتنی کار لە لایەن کەسانێکەوە کە هەستکردنیان بە بەرپرسیارێتی کەمە یان ئەو پەرۆشی خەمخۆرییەی ئەویان نییە بۆ کارەکە.
* سووربوونو پێداگیری لەسەر وەفاداربوون بە گرێبەستو پەیمانو بەڵێنەکان، هەروەك خودا دەفەرموێت: (یا أیها الذین آمنوا أوفوا بالعقود)، خەمخۆری لە دۆزینەوەی شێوازێکی دادگەرانە بۆ هاوسەنگی ڕاگرتن لە نێوان مافەکانی ئەو لایەنەی کاری بۆ دەکاتو مافەکانی لایەنەکانی تر.

ئەو بەرپرسە پەرۆشی ئەوەیە کە ستەمو ناحەقی نەکات بەرامبەر هیچ کام لە لایەنەکەی خۆیو لایەنەکانی ترو لە مافی خۆیان بێبەشیان نەکات...

بەڵام خەمێکی تر هەیە کە هەندێك لە بەرپرسان بە هۆی سەرقاڵیو جەنجاڵیو کاری بەردەوامی ڕۆژانەیان لێی بێئاگا دەبنو گرنگی پێنادەنو بگرە فەراموشی دەکەن، ئەویش بریتییە لە خەمخواردن لە مافو پێداویستییەکانی ئەو فەرمانبەرانەی لە لای ئەو کاردەکەن، چونکە ئەوانیش وەك سەرجەم کەسەکانی تر خاوەنی چەندین پێداویستیو هیواو ئاواتو پابەندین، جا ئەگەر بەرپرس خاوەنی ڕوانینێکی دادگەرانە بێت ئەوا بە هەمان شێوە بیریش لەوان دەکاتەوەو هەوڵدەدات بۆ پەرەوپێشبردنی ڕەوشو بارودۆخی وەزیفیو داراییان کە ئەمەش پاڵیان پێوە دەنێت بۆ ئەوەی هەمیشە بەرەوپێش بچنو کاروبارەکانیان باشتر بکەن، بەڵام دەبێت ئەم کارەی بەرپرسەکە نەبێتە هۆی زیادکردنی ئەرکو قورسایی لەسەر لایەنەکەی لە مەودایەکی نزیك یان دووردا، کە ئەمەش بۆ خۆی خەمو پەرۆشییە.

خۆ ئەگەر بەرپرس خاوەنی دڵێکی گەورەو هەستێکی ناسك بێت، ئەوا خەمخۆرییو پەرۆشی زێتر دەبێت لە ڕێگەی بیرکردنەوەی لە هەستو شعوری سەرجەم ئەو کەسانەی لە دەوروبەرین، بەردەوام بیردەکاتەوە لە:

* چۆنێتی پاراستنی ڕێز لە یەکترگرتنی کەسەکان.
* چارەسەرکردنی هەستی ڕووشێنراوی کەسو کڕیارو فەرمانبەرەکان، کە بە هۆی کارلێکو بەریەککەوتنو تێکگیرانی سروشتی لە کاتی کاری ڕۆژانەدا ڕوودەدات.
* دڵدانەوەو دڵنەوایی کردنی ئەو کەسەی ناڕەحەتیو لێقەومانو کارەساتێکی بەسەردا هاتووە، هەروەها دەربڕینی هەستی خۆشی لە ناخی دڵەوە بەرامبەر ئەو کەسەی خۆشیو شادییەکی تووشهاتووە.
* هەوڵدان بۆ پارێزگاریکردنو فەراهەمکردنی کەشێکی ئیجابیانە لە کاردا، سەرباری هەڵاو ژاوەژاوو ئەرکی قورسی ژیان.

ڕەنگە ئەم خەم وپەرۆشییانە لای زۆرێك لە بەرپرسو خاوەنکارەکان چنگ نەکەون، ئەوەش لەبەرئەوەی ئەوان تەنها کۆکەرەوەی ماڵو هەوڵو تەقەلان، یان خەمو پەرۆشی بەرژەوەندییە کەسیو تایبەتییەکانیان زاڵە، یا خاوەنی بیرۆکەی قوڵو ئاکاری بەرزو جوان نین، یان ئەوەتا هەر بیریان لەو خەمە نەکردۆتەوە.

پەیامبەری خودا (علیه السلام) دەفەرموێت: (أقربكم مني مجلسا يوم القيامه أحاسنكم أخلاقا)، واتە: (نزیکترین کەستان لە منەوە لە ڕۆژی دواییدا، ئەو کەسانەن کە خاوەنی جوانترین ئاکارو ڕەوشتن)، جا نازانم چۆن دەکرێت ئەم فەرموودە پیرۆزە لە واقیعی کاری کارگێڕییدا پراکتیزە بکرێت، بەبێ هەستکردن بەو خەموپەرۆشییە.

زنجیرەی پێنجەم

# چۆن کۆبوونەوە کورت و بەرهەمدارەکان دەبەستیت؟

د. محمد احمد عبدالجواد

و: حسین مەحمود هەڵەبجەیی

لە یادت بێت کە:

* یەکێ لە بەشداربووان لەم کاتانەدا پرسیاری بەدەر لە بابەتەکەت ئاراستە دەکات:

- لە کاتێکدا ئامانجەکە ئاشکرا نەبێت لە نیشاندانی بەندەکەدا.

- بە هۆی هەرکێشەیەکەوە بێت یان پێویستییەك یان پەستانێك.

لەم کاتەدا پێویستە لە سەرت:

* دووبارە دارشتنەوەی ئامانجو روونکردنەوەی بۆ بەشداربوان، دووبارەکردنەوەی ئاگاداری بە دەرنەچوون لە بابەتە سەرەکییەکە.

* وا لە خاوەنی کێشەکە بکە، کە تۆ دەتەوێ بەشداری بکەیت لەگەڵیدا.. بەڵام جیاوازییەکە لە کاتی پێشکەشکردنیدایە.

* ئەو خاڵە گرنگانە تۆمار بکە کە ئەندامان دەوروژێنێ لە کاتی وتوێژدا، ئاگاداربە وتوێژ لەسەر خاڵێك نەکەیت کە لەنەخشەی کارەکاندا نەهاتبێت.

لە یادت بێت:

کاتێك دوو کەس یان زیاتر لە بەشداربووان دەکەونە وتوێژی لابەلایی کە:

* بابەتە پێشنیارکراوەکە بۆیان بە هەندگیرابێتو بیانەوێ گوزارش لە راوبۆچوونی خۆیان بدەن دەربارەی.

* بێتاقەتی رووبکاتە کۆبوونەوەکە.

* وەبیرهاتنەوەی بابەتێك لە لایەن بەشداربوویەکەوە، دەترسێت بیری بچێتەوە یان نەبوونی کاتی تەواو بۆ پشوودان.

لەم کاتەدا پێویستە لەسەرت:

* لە پڕ لە قسەکردن بووەستیت، چاوەروان بیت تا وتوێژە لابەلایەکان کۆتایی دێت.

* قسەکردن لە سەر بابەتەکە بە جددی، نەك بە گاڵتەپێکردنەوە.

* یادهێنانەوەی ئەندامان بە رێزگرتن لەو بۆچوونانەی لە ناو کۆبوونەوەکەدا پێشکەش دەکرێنو باش گوێگرتن لێیان.

* کەمێك لە کات دابنێ بۆ پشوودان، تا مۆڵەت بدەیت بە ئامادەبوان لەگەڵ یەکتریدا بدوێن، لەو کاروبارانەدا کە پەیوەندی بە بابەتەکانی کۆبوونەوەکە نییە.

لە یادت بێت:

لە کاتێکدا یەکێ لە بەشداربووان کۆنترۆڵی کۆبوونەوەکە دەکات کە:

* هەوڵ دەدات سەرنجی ئامادەبووان رابکێشێت بۆ هەوڵەکانیو کارەکانی.

* نرخی کۆبوونەوەکە بە هەند ناگرێت، گرنگی بە کاتو پلاندانان نادات.

لەم کاتەدا پێویستە لەسەرت:

* پرسیار گەلێکی ئاراستە بکەیت کە ناچار بێت بە بەڵێ یان نەخێر وەڵام بداتەوە.

* سەرنجی رابکێشە بۆ وتوێژ دەربارەی ئەو کارەی کە لە بەردەستماندایە.

* ئاگات لە خۆت بێت لە بابەتەکە نەچیتە دەرەوە.

* بە کارامەیی پێی بپچڕێنە، پرسیارێکی راستەوخۆ کە پەیوەندی بە بابەتەکەوە هەبێت.

* سەرنجی رابکێشە بۆ کاتی دیاریکراو بۆ نیشاندانی بابەتەکەی.

* مۆڵەت بە ئامادەبووانی تریش بدە، لەوانەیە بۆچوونەکانیان باش بێت.

* هەستە بە پارێزگاری لاوازەکانو باش کۆنترۆڵ کردنی بەهێزەکان.

لە یادت بێت:

لە کاتێکدا ئامادەبووان هەست بە تورەیی دەکەنو حەز دەکەن برۆن کە:

* کۆبوونەوەکە زیاتر لە کاتی دیاریکراو ببات.

* کاتێ کە ئامادەبووان هەست دەکەن کۆبوونەوەکە بەرهەمدار نییەو هەست دەکەن کاتیان بە فیرۆ دەروات.

* کاتێ کە بەشداربووان پەیوەندی تریان هەیە بە یەکەوە.

لەم کاتەدا پێویستە:

* لە یادت

بێـت ئـەو کۆبوونەوەیـەی زیاتر لە دوو کاتژمێـر دەبـات کاریگەریەکەی نامێنێت.

* ڕاڕا مەبـە لـە کۆتایـی هێنان بە کۆبوونەوەکـە، ئەگەر کاتـی دیاریکراوی تێپەڕاند.
* ڕێز لە کاتی خۆتو ئامادەبووانیش بگرە.
* هـەوڵ مەدە ئەو کاتـە دیاریکراوە تێپەڕێنیـت، مەگـەر دوای وەرگرتنـی ڕەزامەندی زۆرینەی ئامادەبوان.

لە یادت بێت:

لـە کاتێکـدا ئەندامانی بەشـدار بوو پرسـیار ئاڕاسـتە ناکەن، یان وەڵامی ئەو پرسـیارانە نادەنـەوە کـە لێپرسـراوێك دەیکات کە:

* هیـچ گرنگییەك بـە کۆبوونەوەکە نادەن.
* ترسـانیان لـە بەشـداربوون بـە هۆی نائاسـایی کەشو هەوای گشـتی ناو کۆبوونەوەکە.
* لێپرسـراوەکەیان خـۆش ناوێـت یـان شـێوازی مامەڵەکردنـی لەگـەڵ بەشداربواندا.

ئا لەم کاتەدا پێویستە لەسەرت:

* سـوربە لەسـەر ئەوەی ئامادەبووان بۆچوونی دروسـتیان هەبێت بەرامبەر بە کاتی کۆبوونەوەکە دیاریکراوە بۆی.
* بوار بە ئامادە بووان بدە تا گوزارش لە ڕای خۆیان بکەن لە ناو کۆبوونەوەکەدا بە سەربەستییەکی ڕەهاوە.
* لـە یـادت بێـت کـە ئەرکەکانـی سـەرۆکی کۆمەڵەکە ئەوەیـە کە هاندەرو پاڵنەر بێت.
* پرسیاری کراوە بە کاربهێنە (چۆن، کـەی، لە کوێ، بۆچی) بۆ بەدەسـتهێنانی بۆچونو پێشنیاری ئەندامان.
* بـە ڕاشـکاوانە لـە خـۆت بدوێ، ئامادەبـووان هان بدە بۆ ڕێنیشـاندانتو مامەڵەکردن لەگەڵتدا.

لە یادت بێت:

چەند پێویستییەکی بنەڕەتی هەیە لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا:

* ئامانجـی کۆبوونەوەکـە دووبـارە بکەرەوە.
* ئـەوەی بـە ئەنجـام گەیشـتووەو ئەنجامدراوە کورتی بکەرەوە.
* سوپاسـی ئەندامـان بکـە بـە بەشداریکردنیانو گرنگی پێدانیان.
* کاتو شـوێنو سـاتو ئامانجـی کۆبوونەوەی داهاتوو دیاری بکە.
* کاتی ناردنی ڕاپۆرتی کۆبوونەوە بۆ ئەندامان دیاری بکە.

# ئۆفیسەکەت ببینم پێت دەڵێم تۆ کێیت!

و/ عومەر عەبدولقادر

لـە لێکۆڵینەوەیەکدا کـە پێنج هەزار پشـکنینی گرتەوە، ئەوەی دەرخسـت کە لە پشت ئۆفیسـە جیاوازەکانەوە (٩) جۆر فەرمانبەر هەیە، ئەوانیش بریتین لە:

١- ئۆفیسـی پاکوخاوێـنو ڕێکوپێك: بەڵگەیـە لەسـەر فەرمانبەرێکـی چینی ناوەڕاست، کە دەیەوێت بڵێت ئەو کەسێکی ناوازەیـە، بـەڵام بـە پلـەو مافـی خۆی نەگەیشتووە.

٢- ئۆفیسـێك کـە لـە ژێـر کەڵەکەبوونی کاغەزو دۆسـیەو کەلوپەلو شـتە پشـتگوێخراوەکاندا شـاراوەتەوە، بەڵگەیـە لەسـەر فەرمانبەرێکـی زەینو خەیاڵ پەشـۆکاوو شـیاو بـۆ داڕووخانە دەروونییەکان.

٣- ئۆفیسێکی پەشـێو کە پڕیەتی لە کتێبو وێنـەو یاداشـتەکان، خاوەنەکەی کەسـێکی داهێنـەری چالاکـەو حـەز بـە خۆدەرخسـتن نـاکاتو لەسـەر ئەو خووڕەوشتەش دەژی.

٤- ئۆفیسێك کە ڕووناکییەکی کارتێکەری هەبێـتو چەند شـتێکی لێبێـت کە هێما بن بۆ هێزو دەسـەڵات، ئـەوە خاوەنەکەی کەسـێکە چێژ لە بەهرەی سـەرکردایەتی وەردەگرێتو حەز ناکات کەس شـوێنەوارو کاریگەری ئەو لە بیر بکات.

٥- ئۆفیسـێك کە وێنەی ماڵو منداڵ یـان خاووخێـزانو شـتە تاکەکەسـیو تایبەتییەکانـی تێدا هەڵواسـرابێت، ئەوە خاوەنەکەی هەست بە تەنیاییو نائارامیو نادڵنیایی دەکات.

٦- ئۆفیسـێك کە بە پاکەتی جگەرەو فنجانـی قـاوەو کاغەزی پـرشو بڵاوەوە قەرەباڵـغ بووبێت، ئـەوە خاوەنەکەی وا بیردەکاتەوە کە ناچاریو پێویسـتی پاڵی پێوە دەنێت بۆ کارکردن.

٧- ئۆفیسـێك کە نـاوی خاوەنەکەیو پیشـەکەی لەسـەر بوو، ئەوە خاوەنەکەی دەیەوێـت کەسـێکی پەسـەند بێـتو دابنرێت بە پێگەی کۆمەڵایەتیو حەز بە ڕووبەڕووبوونەوە دەکات.

٨- ئۆفیسـێك کـە هیـچ ڕواڵـەتو ڕووخسارێکی تاکەکەسیو تایبەتی پێوە دیار نییە، خاوەنەکەی کەسێکی خاوەن نهێنییەو (غامض)ەو حەز بە زاڵبوون دەکات.

٩- ئۆفیسـێك کە پەنجەرەکانی تەڵخو تاریـكو داخراون، خاوەنەکەی کەسـێکی نائومێدو بێتاقەتو بێزارە.

سەرچاوە: مجلة تكنولوجيا الأدارة، العدد: ٢٢
مجلة تكنولوجيا الإدارة، العدد ١٣

# باشترین و خراپترین بەڕێوەبەر

کەلێنی نێوان باشترین بەڕێوەبەرو خراپترین بەڕێوەبەر بە قوڵی دەمێنێتەوە، ئەگەر هاتوو ئەو شوێنەوارە جیاوازانەو کاریگەرییانەمان لە بەرچاو گرت، کەی بەڕێوەبەر هەست بە باشییەکانی دەکات؟ کەی هەست بە خراپییەکانی دەکات؟ ئەو ڕاستییەی کە پێویستە هەڵوێستەی لە سەر بکەین ئەوەیە کە هەردووکیان: باش‌و خراپ وا باسی خۆی دەکات کە ئەدایەکی کاریگەری هەیە لە وانەیە بەڕێوەبەری خراپ لیستێك بکات بە سەرنەکەوتنی لە سەر کڕیارەکان یا بەرهەم یا بە پێچەوانە بیانوویەك بۆ فاکتەرەکانی سەرنەکەوتنی ئەو تەنگژانەی کە پیایدا تێپەڕیوە.

ئەم پرسیارەی کە لێرەدا خۆی سەرهەڵدەدات، کەی دەزانی کە تۆ بەڕێوەبەرێکی باشی؟ یا بەڕێوەبەرێکی خراپی؟ دەبینین کە بەڕێوەبەری باش ئەوە نییە کە هەموو شتەکانی باشن، بەڵکو لەوانەیە شتی خراپیشی هەبێت، بەڵام باشییەکانی ئەوەندە زۆرن کە خراپەکانیان داپۆشیوە، هەروەها سەبارەت بە بەڕێوەبەری خراپیش هەموو ئەو شتانەی کە هەیەتی خراپ نین بەڵکو لەوانەیە شت گەلێکی باشیشی هەبێت هەروەکو دەڵێن:

مانای ئەوە نییە کە بیپێکی‌و هەڵە نەکەی ئەوەش نییە کە هەڵە بی‌و نەیپێکی،

کەواتە لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کە کۆمەڵێك پێوەرو بنەما هەن کە باشترین بەڕێوەبەرمان لە خراپترین بەڕێوەبەر بۆ جیادەکاتەوە لە ڕێکخراوەکان کە بریتین لە:

١- زۆر خەریکبوون بە کارو کوشتنی کاتێکی زۆر پێوەی بە کوالێتییەکی نزم.

٢- نەمانی گیانی کارکردن‌و پابەندبوون لە نێوان فەرمانبەرەکان.

٣- هەڵسوکەوتی گوێ پێنەدان لە لایەن فەرمانبەرەکان.

٤- سەرهەڵدانی ململانێ‌و پێك نەهاتن لە کاردا.

٥- زۆربوونی دواکەوتن‌و نەهاتنی فەرمانبەر بۆ سەر کار.

٦- نەمانی سەقامگیری دەروونی‌و پیشەیی.

بەڕێوەبەری خراپ لە نووسینگەکەی دەرناچێت‌و گوێ ناداتە ئەو ڕووداوانەی ژینگەی کارەکەی‌و ئاگای لە حاڵی فەرمانبەرەکانی نییە کە چ کێشەیەکیان هەیە، تەنها ئەوە دەزانێت کە سەرزەنشت‌و لۆمەی فەرمانبەرەکان بکات لە سەر کەمتەرخەمی لە هەمان کاتدا خۆشی بەشداره لەم کەمتەرخەمییە بە بێ ئەوەی هەستی پێبکات، ئەو گیروگرفتەی کە بە دوایدا دێت ئەم جۆرە بەڕێوەبەرە خۆی پێ سەرکەوتووە لە کارەکەی‌و هەر ئەو ڕکابەرە یا سەرکەوتوترین بەڕێوەبەریشە، بەڵام هەرچی باش‌و جدییە لە کارەکەی هەروەك (JAMES B.M.) ئاماژەی پێکردووە لە کتێبەکەی (BEST BOSS... WORST BOSS)دا دەڵێت: ئەو ستراتیژییەی کە بەڕێوەبەری باش‌و جدی لە کارگێڕی کارمەندەکانی تیشکی دەخاتە سەر لە دوو هەنگاو پێکدێت:

١- یەکەمجار هۆکارەکانی گازاندەکردن لادەبات.

٢- لە دواییدا هۆکارەکانی سوپاس‌و پێزانین فەراهەم دەکات.

بەڕێوەبەری باشیش کارەکەی بەڕێوە دەبات لە ڕێگای کرێکارەکانی‌و باوەڕیشی بە بنەمای (WIN – WIN) هەیە لە نێوان خۆی‌و کارمەندەکانی هەر بۆیە لە ژێر ڕۆشنایی سیاسەتی بەڕێوەبەری باش کارەکەی بە باشی بەڕێوە دەچێت‌و هەتا ئەگەر ئەو بەڕێوەبەرە نەهاتبوو بۆ سەرکارەکەی، چونکە پابەندبوون‌و (ولاو)ی کارمەندان بۆ بەڕێوەبەر نییە، بەڵکو بۆ ڕێکخراوەکەیانە کە لە ڕوانگەی ئەوان خۆیان خاوەنین‌و داهاتوویان وابەستەی داهاتووی ئەم ڕێکخراوەیە، دروستکردنی

# ستراتیژییەتی بەڕێوەبردن

شاخەوان جەمال

کاتێـك دەوترێت سـتراتیژییەتی فلان کۆمپانیـا یان فـلان ولات بەو شـێوەیەیە، ئـەوا مەبەسـتیان چۆنیەتـیو هونـەری بەڕێوەبردنە، چونکە سـتراتیژییەت واتە: هونەری رابەریکردن، لە سـالانی رابردوودا وشەی ستراتیژییەت لە کاروباری سەربازیدا بەکاردەهێنـرا کـە دوایـی بۆ مەبەسـتی کارگێریو بەڕێوەبردنیش بەکارهێنرا.

ئامانـج لـە دانـانو هەڵبژاردنـی ستراتیژییەت بۆ کۆمپانیا یان ڕێکخراو یان بۆ کاروبـاری ژیانی تـاكو کۆمەڵگەکان، بریتییە لە گەیشـتن بـەو ئامانجانەی کە بەرنامەڕێژیمان بۆ کردوون.

پێویسـتە هەر ڕێکخراوێك بە پێی جۆری کارەکەیو قەبارەیو ئەو بارودۆخەی کە تیایدا دەژی ستراتیژییەتێك هەڵبژێرێت بۆ کارەکانی، چونکە سـتراتیژییەتێك نییە کە بشـێتو لە باربێت بۆ هەموو دامودەزگاو ڕێکخراوێك.

بەشـێوازێکی گشـتی بڕیـارە سـتراتیژییەکان بۆ ماوەیەکـی درێژ دەبن، مـانو نەمـانو گەشـەو لـە کارکەوتنو زیادو کەم کردنو فەشـەلو سـەرکەوتنی ڕێکخـراو و دامو دەزگـاکان لەسـەر ئـەو بڕیارە سـتراتیژییەتیانە بەندە کە لەلایەن گارگێـڕی بالاوە دەدرێـن، ئەگەر بێتو بە وردیو بە شـێوازێکی زانستی ئەو بڕیارانە نەدرێن ئـەوا دوور نییـە ڕێکخراو نەگات بەو ئامانجانەی کە لەپێناویدا بەدیهاتووەو درروست بووە.

کەواتـە ئـەی خوێنـەری ئازیـز، ئەگەر دەتەوێت لە ژیانتدا سەرکەوتوو بیت ئەوا بزانە سـتراتیژییەتی ژیانت چـۆن هەڵدەبژێریتو بڕیاری چۆنییەتـی ژیانت بدە، چونکە تەمەن کورتەو بەشی هەموو خەونەکانت ناکات بزانە چۆن سوودی لێوەردەگریت.

ژیلە دابان

کەشێکی بەرهەمدارو بەرزکردنەوەی گیانی مەعنەویو دەرفەتی داهێنانو پێشکەوتنی کارمەندەکانـی زیاتر دەبێـت، ئەمەش بە کارکردنی بەڕێوەبەری باشە لە سەر ئەدای کارەکە بە شـێوەیەکی باشترو کاریگەرترە تاوەکـو هەسـتو سـۆزی خۆشەویسـتیو هاوکاری لە نێوان بەڕێوەبەرو کارمەندەکانی سـەرهەڵبدات، ئەگەر هاتـوو بەراوردێکی سـادەمان لـە نێـوان بەڕێوەبـەری باشو خراپدا کـرد ئەم جیاوازیانەمـان بەرچاو دەکەوێت:

| خراپترین بەڕێوەبەر | باشترین بەڕێوەبەر |
|---|---|
| * بەرهەمەکانی لاوازن. | * بەرهەمەکانی زۆر بەرزن. |
| * زۆر گومان دەبات بە فەرمانبەرەکانی. | * متمانە دەبەخشێت بە فەرمانبەرەکانی. |
| * باوەری بە بنەمای کەمکردنەوەو رق لێبونەوەیە. | * باوەری بە بنەمای هاندانو پاڵپشتی کردنە. |
| * کاردەکات بۆ تاوانبارکردنی فەرمانبەرەکانی. | * بەرپرسیارییەتی هەڵەی فەرمانبەرەکانی هەڵدەگرێت. |
| * پاڵپشتی سەرکەوتنی دانایی دەکات بۆ خزمەتی خۆی. | * پاڵپشتی سەرکەوتنی کارمەندەکانییەتی. |
| * کارمەند لە لای ئەو بە کرێگیراوە. | * کارمەند لە لای ئەو هاوبەشە. |
| * مامەڵەکردنی لە سەر بنەمای داهات/ زیانە | * مامەڵەی بە بنەمای داهات/داهاتە. |
| * مەشقکردنو پەرەپێدان بە شتێکی لاوەکیو کوشتنی کات دادەنێت. | * پابەندە لە سەر مەشقکردنو پەرەپێدانی خۆیو کارمەندەکانی. |

# مەیموونێکی دانا

ڕۆژێکیان مەیموونێکی پیرو دانا بە تەنیا لە خانووەکەی کە لە نێو جەنگەڵستاندا لەسەر لێواری ڕووبارێکی بچوکدا بوو دەژیا، بەڵام ئەم مەیمونە هەرگیز نزیکی ڕووبارەکە نەدەبووەوە، چونکە ڕووبارەکە پڕبوو لە نەهەنگ، مەیموونیش لێیان دەترساو نەهەنگەکانیش بە ئاواتەوە بوون ڕۆژێك بیگرنو بیخۆن..

لەو دیوی ڕووبارەکە، دارمۆزێکی گەورەو بڵند هەبوو، ڕۆژێکیان مەیموونەکە لەسەر لقە دارێك دانیشتبوو بینی مۆزەکان چۆن زەردو گەورەبوون.. ئارەزووی دەکرد لێیان بخوات، چونکە زۆر حەزی لە مۆز دەکرد وەلێ نەی دەزانی چۆن چۆنی بپەڕێتەوە ئەوبەر ڕووبارەکە.

قەدەر وابوو ڕۆژێك چەند داربڕێك هاتنو دارێکی بەرزیان بڕییەوە دارەکە کەوتە سەر ڕووبارەکە بەجۆرێك بە ئاسانی دەکرا لەسەری بپەڕێتەوە ئەوبەری ڕووبارەکە کاتێ پیاوەکان ڕۆیشتن، مەیموونەکە لەگەڵ خۆیدا کەوتە گفتوگۆو وتی: من لەسەر دارەکە دەپەڕمەوە ئەوبەری ڕووبارەکەو دەتوانم بە ئارەزووی خۆم مۆزەکان لێبکەمەوە.

سەیرێکی دەورووبەری خۆی کرد، سەرو خواری ڕووبارەکەی پشکنییەوەو بە پەلە لەسەر دارەکە بۆ ئەوبەری ڕووبارەکە پەڕییەوە، بێ وەستان بەرەو لای دار مۆزەکە چوو، بە دارەکەدا هەڵگەڕاو دەستیکردە خواردنی مۆزە زەردو گەورەکان.

یەکەمیانی خوارد زۆر بەتام بوو، مۆزی دووەمیشی خوارد ئەمیشیان بەلەزەت بوو، مۆزی سێیەمیشی خوارد، بەردەوام بوو لە خواردنی مۆزە گەیوەکان تا دوا مۆزی لە دارەکان کردەوە، یەك مۆزیشی لەگەڵ خۆی هەڵگرتو بە نیازی گەڕانەوە بۆ ماڵەوە کەوتە ڕێ، لەگەڵ خۆیدا کەوتە گفتوگۆو وتی:

ئیتر لەم دەوروبەرانە مۆز نەماوە... باشتر وایە بگەڕێمەوە ماڵەوەو سەرخەوێکی بۆ بشکێنم.

مەیموونە پیرو داناکە هاتە خوارەوە بەرەو ئەو شوێنەی کە لێی پەڕیبۆوە کەوتە ڕێ، بینی دارەکەی لێ نەماوە دیاربوو پیاوە دار بڕەکان گەڕابوونەوەو دارەکەیان بردبوو، لەو شوێنەی کەدارەکەی لێکەوتبوو نەهەنگێکی گەورەی دی، ڕەنگی نەهەنگەکە زۆر لە درەختەکە دەچوو، هەربۆیە زۆری نەمابوو مەیموونەکە بەسەریا بڕوات، دوو نەهەنگی بچوکتر لە تەك نەهەنگە گەورەکەدا بوون، نەهەنگەکان وتیان:

بەه بەه ئێستا خواردنێكی باش دەخۆین، سڵاو مەیموونی قەڵەو وجوان، مەیموونی بێچارە ترس دایگرت، وەلێ مەیموون ژیرو دانا بوو.

مەیمون وتی:

من بەشی ئێوە ناكەم، ئێوە زۆر گەورەن، من لە بەرامبەر ئێوە گەلێك بچوكم، ئێوە چەند دانەیەكن‌و منیش تاقە دانەیەك، ئەوەش بزانن من پیرم‌و گۆشتەكەشم تفتو جیرە، باشتر وایە ئێوە شتێكی تر بدۆزنەوەو بیخۆن، نەهەنگە گەورەكە وتی:

تۆ هەرچەندە بچوك‌و جیر بیت ئێمە دەتخۆین تۆ قەڵەویتو هیچ نەبێ هەریەكە پارویەكمان بەردەكەوێت.

نەهەنگە بچوكەكان بە شادییەكی فراوانەوە وتیان:

بەه بەه چ خواردنێكی خۆش، چ خواردنێكی بە تام‌و بە لەزەت!

مەیمون وتی: زۆر باشە، ئێستاكە ئێوە دەتانەوێ بمخۆن هیچ قسەیەكم نییە، بەڵام دەبێت یەكەمجار ئێوە بژمێرم، ئاخر دەمەوێ بزانم چەند دانە نەهەنگ دەمخۆن، بێ زەحمەت لەناو رووبارەكەدا بەریز بووەستن، دواتر هەرسێ نەهەنگەكە بە پانایی رووبارەكە بەریز وەستان، مەیموونەكە چووە سەر نەهەنگی یەكەم‌و هیچ پەلەی نەكردو بە ئارامییەوە پێی دانا، ئەمە یەك نەهەنگ، دوایی لەسەر خۆ چووە سەر نەهەنگی دووەم‌و وتی، ئێستاش ئەمە دەبێتە دوو نەهەنگ، دوایی گەیشتە سەرپشتی نەهەنگی سێیەم، دیسان بەهێمنییەوە پێی هەڵگرت تا لەسەر كەللەی نەهەنگەكە وەستاو بەئارامییەوە وتی، دوو نەهەنگم ژماردووە ئەمیشیان نەهەنگی دواییە، هەر كەوتی نەهەنگی سێیەم خێرا بازی دایە كەناری رووبارەكەو چۆن (با) گوزەر دەكات ئاوها بەپەلە بۆ سەر دارێكی بەرزو سەركەش رۆیشتو بۆ خۆی لێی دانیشت و سەیری نەهەنگەكانی دەكرد، نەهەنگەكان كەوتنە دوای مەیموونەكە، بەڵام نەیان توانی بەسەر دارە بەرزەكەدا سەربكەون‌و مەیموونەكە بگرن، لە ئەنجامدا نەهەنگەكان گەلێك پەستو قەڵس بوون‌و ناچار بەرەو رووبارەكە گەڕانەوە، مەیموونەكەش دوای ماوەیەك سەیرێكی رووبارەكەو ئەملاولای خۆی كردو لە دارەكە هاتە خوارێ‌و بۆ ماڵەكەی گەڕایەوەو لێی خەوت...

سەرچاوە/ چیرۆكێكی میللی فلیپینی

هەڵبژاردنی:

**پشتیوان عەبدوڕەحمان**

# منداڵێك باسی خۆی دەكات

## لە قوتابخانەدا چۆن هەڵسوكەوت دەكەم؟

منداڵان ئێمە بۆیە دەچینە قوتابخانە تاكو فێری خوێندنەوەو نووسین‌و ئاكاری جوان ببین، هەروەها بۆئەوەی شارەزایی لە زانستی جۆراوجۆردا پەیدابكەین، تاكو بتوانین لە ئایندەدا خزمەتی كۆمەڵگەو نیشتیمانەكەمان بكەین. دیارە ئەمانەش بە هۆی ئەركو ماندووبوونی مامۆستاكانمانەوە بە دەست دەهێنین، مامۆستاكانمان تەمەنێكی زۆریان بە دوای فێربوونی زانستو زانیاری بەسەر بردووەو رەنجی زۆریان كێشاوە، وا ئەمڕۆش زانستەكەیان بە ئێمە دەبەخشنەوە، بۆیە لەسەر ئێمەش پێویستە رێز لە مامۆستاكانمان بگرین‌و بە جوانی لە بەرامبەریاندا هەڵسوكەوت بكەین.

* من‌و هاوپۆلەكانم لە كاتی هاتنەژوورەوەی مامۆستا بۆ هۆبەكەمان، زۆر بەجوانی وەڵامی سڵاوەكەی دەدەینەوەو بە دیتنی خۆشحاڵ دەبین.

* ئێمە ئەگەر لە دەرەوەی پۆلیشدا مامۆستاكانمان ببینین، بەرێزەوە سڵاویان لێدەكەین، ئەگەر قسەی لەگەڵ كردین بە جوانی گوێی لێ رادەگرین‌و بە نەرمی لەگەڵیدا دەدوێین.

* كاتێك مامۆستا وانەمان بۆ رادەدكات، من‌و هاوپۆلەكانم بە جوانی گوێی لێرادەگرین، خۆمان بە كتێبو شتی ترەوە خەریك ناكەین‌و لەگەڵ یەكتردا قسە ناكەین.

* ئەگەر لەناو وانەدا پرسیارێك یان داوایەكمان هەبێت لە مامۆستا، یەكسەر لەجێگەی خۆمانەوە قسەناكەین‌و قسەی مامۆستا نابڕین، بەڵكو دەستمان بەرزدەكەینەوەو چاوەڕێی مامۆستاكەمان دەكەین تاكو رێگەمان پێدەدات.

* من رۆژانە ئەركەكانی ماڵەوە كە مامۆستا لە قوتابخانە پێمان دەدا بە باشی دەیانخوێنم‌و ئامادەیان دەكەم.

* من وانەكانم بە خەتێكی جوان دەنووسمەوەو پارێزگاری لە كتێبو دەفتەرو كەلوپەلەكانی خۆم‌و هاورێكانم دەكەم‌و بە پاكوخاوێنی رایان دەگرم.

* من كەلوپەلەكانی قوتابخانە دەپارێزم، هەروەها پارێزگاری لە پاكوخاوێنی قوتابخانە دەكەم.

* من رێز لە سەرجەم مامۆستایانی قوتابخانەو بەرێوەبەرو فەرمانبەرەكان دەگرم‌و وەفادار دەبم بەرامبەر بە چاكەكانیان.

* من هەموو هاوپۆلو قوتابیانی قوتابخانەكەم بە خوشكو برای خۆم دەزانم‌و خۆشم دەوێن و یارمەتیان دەدەم.

بەشی سێیەم و کۆتایی

# 22 یاسای جێگیر لە بازاڕسازیدا

هاژە شێروانی

لە زنجیرەی یەکەمو دووەمی ئەم بابەتەدا، ئاماژەمان کرد بە ١٤ یاساو لەم زنجیرەیەشدا هەوڵ دەدەین کە هەشت یاساکەی تر بخەینە بەردەم خوێنەری بڕیاری ئازیز کە بریتین لە یاسای (ڕاشکاوی، تاکڕەوی، لە ناکاوی، سەرکەوتن، پڕوپاگەندەو ناوبانگی، هەرەس هێنان، خێرایی، سەرچاوەکان) بفەرموون:

١٥- یاسای ڕاشکاوی: (هەتا دان بنێی بە کارە نێگەتیڤەکانتدا، کاردانەوەکەی پۆزەتیڤ دەبێت):

* یەکێک لە کاریگەرترین شێوازەکانی چوونە نێو هزری کڕیار لە سەرەتادا بریتییە لە دان نان بە کارە نێگەتیڤەکەت، لە دواییدا گۆڕینی لە نێگەتیڤەوە بۆ پۆزەتیڤ.

* هەر ڕاستییەکی نێگەتیڤ کە دان پیادەنرێت خەڵک وەکو ڕاستییەک قبوڵی دەکەن.

* پێویستە کە ئەم یاسایە زۆر بە کارزانیو لێهاتوویی بە کار بهێنرێت.

ئەم یاسایەش بە (کابوس)ی بازاڕسازەکان دادەنرێت، کەواتە ژیریو مەنتیقی ئاگادارت دەکەنەوە بەوەی کە پەیامی بازاڕسازییەکەت پێویستە هەمووی پۆزەتیڤ بێت، جا چۆن دان بە هەڵەیەکدا دەنێین کە تێی کەوتویت، بەڵام ئەم یاسایە دڵنیات دەکاتەوە کە ئەگەر ڕێگەیەکت گرتە بەر بە ڕاشکاوی دەرەنجامەکەی پۆزەتیڤ دەبێت، پێویستە کەسانی جێگای متمانە بڕیار بدەن لە سەر ئەوەی کە تۆ هەڵەیەکت هەیەو دانت پێداناوە.

لە لایەکی تر، ئەگەر ئەم یاسایەت فەرامۆش کرد، دەکەویتە ژێر پێی نەزانی خۆت، چونکە کڕیارە زیرەکەکان چەندی بیانەوێت جگە لەمەو زۆری درۆکانیش وات لێدەکات کە باوەڕیان پێبکەیت، لە دواییدا زەرەرمەندبوونت، زیاد ڕەوی کردن لە هەر بەشێکی هەموویت لێ تێک دەدات، بۆیە ئەوە بخە بازاڕ کە دەیفرۆشیت، بەڵام بە دانایيو زیرەکیو زیادەڕۆیی نەکردن تیایدا.

١٦- یاسای تاکڕەوی: (لە هەر هەڵوێستێک تەنها یەک هەنگاو هەیە کە دەرەنجامی هەست پێکراوت بۆ بگێڕێتەوە):

* تاکە شت لە بازاڕسازیدا بریتییە لە تاکڕەوی کە لێدانێکی بەهێزە، لە بری کۆششە زۆرەکانو لاوازو نادیارو کاریگەر کەمەکان.

* هەمیشە وادەبێت کە خاڵێکی لاواز هەیە لە لای بەرامبەرەکەت، هەر ئەم خاڵەیە کە دەبێت تیشکی بخرێتە سەر بۆ ڕکابەری کردن.

* ئەوەی کە لە بازاڕسازیدا سوودی هەیە هەر خۆیەتی، ئەوەی کە لە جەنگیشدا سوودی هەیە هەموو شتێکی پێشبینی نەکراوە.

* بۆ زانینی ئەم بیرۆکەیە (بنەما تاکڕەوە) لەسەر بەڕێوەبەری بازاڕسازی پێویستە کە بزانێت چی باش هەیە (لە مەیدانی جەنگدا) کە بازاڕەکەیە.

ئەگەر ڕیکلامێکت لە گۆڤارو ڕۆژنامە بڵاوکردەوە، کڕیاریش بینی ئایا دووجار بەرهەمەکەت دەکڕێت؟ سەرکەوتنی هەڵمەتەکانی بە بازاڕخستنیش پێوانە دەکرێت بە کاریگەرییەکەی لە سەر فرۆشتن نەوەك بە ماوەی دووروودرێژی کە تیایدایە، باشترین دەرەنجامیش کە دەستەبەری دەکات باشترین بیرۆکەیە ( یەك‌و جیا بێت)، کە ئەمەش پێویستی بە هەموو پاڵپشتێکە.

* لە جەنگی بازاڕسازیدا براوە نیت بە دووبارە کردنەوەو لەوەی پێشووتر هەتبووەو کردووتە، بەڵکو پێویستە لە سەرت کە بەردەوام لە نوێبوونەوەو گۆڕانو جیاکاریدا بیت.

١٧- یاسای لە ناکاوی: (ئەگەر تۆ نەبوویت کە پلانی ڕکابەرانت دانا، ناتوانیت پێشبینی بکەیت بە داهاتوو):

* پلانی دووروودرێژو گشتگیر نابێتو سوودی نییە، چونکە دەبێت پلانی بازاڕسازییەکەت نەرمو نیانو شایستەی گۆڕان بێت بە خێراییو بە نەرمی.

* هەرەس هێنان لە پێشبینی بە کاردانەوەکانی ڕکابەران لە گرنگترینی

هۆیەکانی هەرەسی پلانی بازاڕسازییە.

* بۆ هیچ کەسێك نییە کە پێشبینی داهاتوو بکات بە هەر پلەیەکی وردبینی بێت، هەر بۆیە نابێت کە پلانی بازاڕسازی ئەمەی تێدابێت.

* گۆڕانکاری ئاسان نییە، بەڵام تاکە ڕێگایە بۆ گونجان لەگەڵ داهاتوو کە پێشبینی بۆ ناکرێت، پلانی گشتگیرو درێژخایەن سوودی نابێت، چونکە داهاتوو نهێنیو لە ناکاوییەکانی خۆیت بۆ دەرناخات، هەر بۆیە دەتوانین بە دواداچوون بۆ بانگەشە نوێیەکانی بکەینو گۆڕانکارییەکانی ئارەزووی گشتی، بەڵام پلانی درێژخایەنو گشتگیر سوودی نابێت بۆ ڕکابەران سەرسامان دەکەن بەوەی کە لە خەیاڵدا نییە، کە وادەکات کە ئەم پلانە درێژخایەنە سوودی نەبێت.

**١٨- یاسای سەرکەوتن:** بە زۆری سەرکەوتن دەبێتە هۆی لە خۆباییبوون، لە خۆبایی بوونیش دەتگەیەنێتە هەرەس هێنان، ئەم یاسایە داوات لێدەکات کە لە کڕیارەکانت دوور نەکەویتەوە، لەگەڵ گەورەبوونی قەبارەی کۆمپانیاکان، بەڕێوەبەرانیش سەرقاڵ دەبن بە وردەکارییەکانو کۆبوونەوە درێژەکان، کەوا لە کڕیارەکان دەکات دوور بکەونەوە، ئەوانەی کە هۆی سەرکەوتنی هەر کۆمپانیایەکن:

* ئەرکو کارەکانی بازاڕسازی مەسپێرە بە شوێن کەوتووەکان، بەڵکو لە ناوجەرگەی تیمەکەدابەو خۆت بە دواداچون بۆ بارودۆخی بازاڕبکە، باشتر وایە کە خۆت یەکجار ببینیت لە بری ئەوەی کە سەدجار گوێت لێبێت.

**١٩- یاسای هەرەس هێنان:** (پێویستە کە پێشبینی هەرەس بکەیتو چاوەڕوانی ببیتو وەریبگریت):

* خودی مرۆیی دوژمنی بازاڕسازی سەرکەوتووە، بازاڕسازیش بە بارێکی کەسێتی داناندرێت، ئەوەی کەسایەتی تۆ دەیەوێت ناتوانێت بیگۆڕیت بەوە کە بازاڕ دەیەوێت.

* کاتێك کە (مارکە)یەك سەردەکەوێت، وا دەزانین کە ناوەکەی هۆکاری یەکەمی سەرکەوتنییەتی، لە ڕاستیدا ( مارکە)ی سەرکەوتوو ئەوەیە کە هاوشانە لەگەڵ یاساکانی بە بازاڕخستن.

* هیچ شتێکی بە بەهامان نابێت، ئەگەر خۆمان تووشی ترسناکی نەکەین، سەرەڕای ئەوەی کە دەیزانین، ترسناکی دیراسەتکراو دەرەنجامەکەی پۆزەتیڤ دەبێت باشترە لە بێدەنگیو دانیشتن بە بێ هیچ ترسناکییەك.

* کاتێك کە درك دەکەیت کە تۆ هەڵەیت، هەڵسە بە وەستاندنی خوێنی زیانەکانت، لە مەیدانی جەنگدا بە هەرەس هاتوو دەربچۆ.

* ئاستەمە کە دان بە هەڵەکانماندا بنێین، بە تایبەتی ڕەتکردنەوەی دەوڵەمەندمان دەکات لە ئاستەمی دان پیانان.

* پێویستە کە بزانیت کەی پێداگری لە سەر ڕاو بۆچوونی خۆت دەکەیت، کەی دەکەویتە ژێرباری واقیعو لەگەڵی دەگونجێیت.

* بۆئەوەی کۆمپانیا بە شێوەیکی نموونەیی کار بکات، پێویستە کە پاڵپشتی کاری بە کۆمەڵ بکاتو گیانی یەك تیمی بڵاوبکاتەوە، لەگەڵ سەرکردەیەك کە ئامادەبێت قوربانی بدات.

**٢٠- یاسای پروپاگەندەو ناوبانگی:** (هەڵوێستی ئێستا هەمیشە پێچەوانەی ئەوەیە کە ڕۆژنامەوانی هەوڵی بڵاوکردنەوەی دەدات):

کاتێك کە کارەکان بە ئاسانی دەڕۆن، هیچ پروپاگەندەیەکی زۆر نازانیت کە هەموو شتێك باشە، کاتێك کە پێویستت بە پروپاگەندەیەکی ئاراستەکراوە بۆ دڵنیابوون لەوەی کە هەموو شتێك لەوپەڕی باشیدایە، لەم ساتەدا تۆ کەوتویتە ناو کێشەوە، هەروەك دەبینین کە مێژووش پڕیەتی لە هەڵوێستی بە بازارخستنی هەرەس پێهاتوو، لە هەمان کاتدا کە ڕۆژنامەوانی ئەو کات دووپاتی ئەوپەڕی سەرکەوتنی لە سەرکردبوەوە، بۆ نموونە گفتوگۆی ڕاگەیاندنی جیهانی لە سەر فڕۆکەی هەلیکۆپتەری کەسی، کە چاوەڕوان دەکرێت کە لە سەرووی ئۆتۆمبێل بە کار بهێنرێتو دەبینین کە ڕووی نەدا، هەروەك وا دانرا کە ماڵپەری ئەمازۆن (بە فرۆشتنی کتێب) پەرتوکخانەو مەڵبەندەکانی فرۆشتنی کتێب لە ناو دەبات، ئەمەش کە تا ئێستا ڕووی نەداوە.

**٢١- یاسای خێرایی:** (پرۆگرامی سەرکەوتوو لە سەر دیاردەی کاتی بنیات نانرێ، بەڵکو لە سەر ئاراستەو پێ باشترەکانی کڕیار دەبێت):

* دیاردە سەرهەڵدراوەکان، ڕووداون کە تەمەنیان کورتە، دەتوانرێت قازانجدار بێت بەڵکو ئەوەندەش نامێنێتەوە کە سوود مەند بێت بۆ کۆمپانیا.

* باشترین شێواز بۆ پارێزگاری کردن لە سەر داواکاری بەهێزو بۆ ماوەیەکی درێژخایەن، لە ڕێگای پڕنەکردنەوەی ئارەزووەکانی ئەم داواکارییەیە، وابکات هەموو کات کە خستنە ڕوو لەو کەمتر بێت (وەکو نوێترین ئامێری نۆکیا) کە هەرگیز بە تەواوی نابینرێت تەنها دوای کەم بوونەوەی داواکاری لە سەری.

* باشترینو بە قازانجترین شت لە بازاڕسازیدا بیکەیت کە هاوشانی شەپۆلێکی نوێ بێت لە باشترەکانی خەڵکو ئارەزوویان، شەپۆلێك کە بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ بەردەوام بێت.

کاتێك کە کۆمپانیا وەبەرهێنان دەکات بۆ سوودمەندبوونی لە گۆڕانکاری کتوپڕو کاتی لە ئارەزووی بەکارهێنەران (مۆدێل)ە، لێرەدا زۆر بە توندی تووشی ترسناکی دەبێت، کە پێویستی بە هەندێك کات هەیە تاوەکو لەگەڵ ئەم مۆدێلە ڕێ بکات، زۆرجاریش وای دەبینین کە ئەم مۆدێلە دووبارە گۆڕاوە کاتێك کە کۆمپانیا بە تایبەتی بەرهەمی هێنا لەگەڵ دەستپێکردن بە بڵاوبوونەوەی مۆبایل، خەڵك داوای تەلەفۆنێکیان دەکرد کە دوو سیم کارت لە خۆ بگرێتو لەگەڵ سەرهەڵدانی درك کردنی کڕیار بە سوودە کەمەکانی وازیان لێهێنا، لێرەدا کۆمپانیاکان زیانێکی زۆریان کرد بە هۆی مانەوەی ئەم ئامێرانە لە لایان.

هەروەك دەبینین کە گۆڕانکارییە کتوپڕو لە ناکاوەکان لە ئارەزووی کڕیار بە شێوەیەکی خێرا پێش دەکەوێت، بەردەوام نابێت لە هەمان کاتدا کە گۆڕینی باشترینەکانی کڕیار لە سەر ستایلێکی خاو دەڕوات، بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ بەردەوام دەبێت، هەموو دەرفەتێکی بەردەست شایەنی ئەوە نییە کە خۆتی بۆ بخەیتە ترسناکی.

**٢٢- یاسای سەرچاوەکان:** (بە بێ پارەدارکردنی تەواو، بیرۆکە نوێیەکە سەرناکەوێت):

* بازاڕسازی هیچ نییە جگە لە جەنگێك کە لە ناو ژێری بەکارهێنەردا ڕوودەدات، تۆ پێویستت بە خەرج کردنی داراییەکە تاوەکو بچیتە ناو ژێریان، هەروەها پێویستت بە خەرج کردنی زۆرترە بۆ مانەوە تیایدا دوای چوونە ژوورەوەو جێ کردنەوەت.

* بازاڕسازە سەرکەوتووەکان هەموو داهاتیان لە دووساڵ یا سێ ساڵی یەکەم خەرج دەکەن، هیچ قازانجێکی تیادا ناکەن، کە ئەم داراییانە لە دەورو خولی چالاکییەکانی بازاڕسازیدا دەبن لە پێناو گەورەکردنی قەبارەی کارەکانیان.

* پارەو هێزە کە پێچکەکانی بازاڕسازی دەخولێنێتەوە، تاوەکو سەرکەوتوو بێت پێویستە کە ئەو داراییە بدۆزێتەوە کە پێویستتە تاوەکو بەردەوام بێت.

سەرەڕای دروستی ئەم یاسایە بە ڕێژەی ١٠٠٪ بەڵام کۆمپانیای تازە دامەزراو ناتوانێت جێبەجێی بکات، چونکە گرنگترین شت لە لای پاراستنی (دراوی کاشە)و ڕێچکەی ئەو داراییەی کە دێتە ناو کۆمپانیا.

هەر بۆیە دانەران ئەم یاسایەیان خستە کۆتایی، بە سوود وەرگرتن لێی تاوەکو بزانین کە هەموو یاساکانی پێشوو جێبەجێ دەکرێت پێش ئەوەی بێنە بەشی بازاڕسازیو هەموو ئەو داراییە خەرج بکات، نابێت هیچ خەرج بکرێت لە هەمان کاتدا کە تۆ خاڵی لاوازت هەبێت، گرفتەکانت چارەسەر بکە لە دواییدا بە هەموو هێزت بەرهەمەکانت بخەرە بازاڕ.

# بێبازاڕی

و: دانا فوئاد حەمەصاڵح

## پێناسەی بێبازاڕی:

زاراوەیەکە لە ئابووری گشتیدا بەکاردێت، بەهەمـوو ئـەو پووکانەوە بەرچـاوو فراوانە دەوترێت کە ڕوودەدات لەچالاکی ئابووریدا، بۆ زیاتر لە چەنـد مانگێك بەردەوام دەبێت، بە تایبەتی بەو ماوانـە دەگوترێت کە بەرهەمی ناوخۆو بەرهەمی گشـتی تیایـدا دادەبەزێت، کـە بـە لایەنـی کەمەوە بـۆ ماوەی شـەش مانگ بـەردەوام دەبێت، ئەمـەش یەکێکە لە قۆناغەکانی خولی ئابـووری کە زۆربەی کات بێکاری زیـاد دەبێتو نرخی وەبـەر هێنانو قازانجی کۆمپانیاکان دادەبەزێت.

بێبـازاری دەبێتـە هـۆی دابەزیـنو کەمبوونـەوەی بەرهەمو نرخو کارو داهات، لە مـاوەی بێبازاڕیدا جوڵەی نەختینەیی زۆرێك لەکۆمپانیـاکانو دامـەزراوە جۆراوجـۆرەکان مایە پوچ دەبن، لەگەڵ ئەمەشـدا ژمارەیەکی زۆر لەکرێـکارانو فەرمانبـەران کارەکانیـان لەدەست دەدەن.

## قۆناغەکانی بێبازاری:

یەکەم قۆناغی بێبازاری دەسـت پێدەکات بە دابەزینی فرۆشتن لە لایەن ژمارەیەکی زۆر لە کۆگا بازرگانییـەکان، یان ئەو بازرگانانەی کـە بەکۆمـەڵ کەلوپەلەکانیـان دەفرۆشـن، ئەمەش بە هۆی کەمبوونەوەی توانای کڕینی بەکاربەران.

کاتێك کە فرۆشـتن دادەبەزێت لە لایەن کـۆگا بازرگانییەکانـەوە، ئەمـەش وادەکات خواست لەسەر کارگەکان دادەبەزێتو کارگەکان ناچار دەبن بە کەمکردنەوەی بەرهەمەکانیان، ئەمەش دەبێتـە هۆی نزم بوونەوەی خێرایی وەبەرهێنان لەدروستکردندا، لە هەمانکاتیشدا دامەزراوە پیشەسـازییەکان توانای خۆیان لە دەسـتدەدەن بـۆ پێدانی موچـەی کرێکارو فەرمانبەرەکانیـان بـە هـۆی کەمبوونەوەی خواست لەسەر بەرهەمەکانیانو دابەزینی نرخ کە ناچاریان دەکات ژمارەیەکی زۆر لە کرێکارو فەرمانبەرەکانیان لاببرێن لەسـەر کارەکانیان، ئـەم هەنگاوەی خاوەن کارگـەکان ئەنجامێکی ناخۆشی لێدەکەوێتەوە، کە ئەویش زیادبوونی ڕێژەی بێکارییە کە ئەمیش ئاشـکرایە دەبێتە هـۆی دابەزینی زیاتری توانای کڕین لە لایەن بەکاربەرەوە.

ئـەم ئەنجامـە نەرێیانـەی بێبازاڕیـش بـەردەوام دەبێت بە شـێوەیەکی زۆر خراپتر لـە پێشـوتری تـا دەگاتـە ئـەو ڕادەیـەی ئاوەژوکردنەوەی هاوکێشـەکەو گەڕاندنەوەی چالاکی ئابووری بۆ بوژاندنەوەی پێشوی.

## هۆکارەکانی بێبازاری:

هەندێـك لەئابـووری ناسـان پێیان وایە فاکتـەرە دەرونییەکانـی وەك (گەشـبینیو ڕەشـبینی) ڕۆڵێکی کاریگـەری هەیە کەوا لە تاکـەکان بـکات بڕیاربـدەن خەرجییەکانیان زیاد بکەن یاخود پاشـەکەوت بکەن، هەروەها بیـردۆزی ئابـووری تـر هەیە کە هـۆکاری بێبـازاڕی دەگەڕێنێتـەوە بۆ گـۆڕان لە ناکاو لە پێکهاتەی دانیشـتواندا بە هۆی زیادبوونی ڕێـژەی لە دایکبـووان یاخـود کۆچکردنەوە، کاتێك کەژمـارەی پەنابەران بـۆ وڵاتێك یان ڕێژەی لـە دایکبووان زیاد دەکات بەو هۆیەوە تێکـڕای خەرجـی زیـاد دەکات، هەروەهـا بەپێچەوانەشـەوە هەندێك بیردۆزی ئابووری تر هەیە کە ڕازیبوون لە لایەن بەکاربەرانەوە بـۆ بەرهەمێکی دیاریکـراو وەك تەلەفزیۆنو ئۆتۆمبێلو سـەلاجە کـە دەبێتە هۆکارێك بۆ بێبازاڕی.

هەروەهـا هەندێـك بیـردۆزی تـر پێی وایـە پەیوەندی هەیـە لە نێـوان بێبازاڕیو خولـی ئابووری کـە لە مـاوەی بوژاندنەوەی ئابووریدا گۆڕانێکی گەورە ڕوودەدات لە بواری پیشەسازیدا، کاتێکیش ئەم گۆڕانکارییە دەگاتە ترۆپك دەستدەکات بە گەڕاندنەوە، وەبەرهێنان کەم دەبێتەوە بۆ ئسوڵی پیشەسازی هەربۆیە چالاکییەکانی کەم دەبێتـەوە لە چاو تێکڕای چالاکییەکانـی پێشـویداو دەچێتـە قۆناغی پوکانەوە.

## ئەنجامەکانی بێبازاڕی:

کاتـێ کـە بێبـازاری توشـی وڵاتێك لە وڵاتەکان دەبێت زیانێکی گـەورە دەگەیەنێت بەڕێژەیەکـی گـەورە لـە دانیشـتوان کـە فەرمانبـەرو کرێکارەکانیان لەدەسـت دەدەن، ئەمـەش دەبێتە هـۆی بڵاوبوونەوەی بێکاری لەگـەڵ هـەژاری و نائومێـدی، ژمارەیەکـی زۆریشـیان ناچـار دەکات پەناببەنـە بـەر دامەزراوە خێرخوازییەکان بۆ پێدانی یارمەتی لەبەرئـەوەی کـە ناتوانن پێداویسـتییەکانی خۆیـان دابیـن بکـەن، ژمارەیەکی تریشـیان توانایـان نابێـت کرێی خانووەکانیـان بدەن، بەم هۆیەشـەوە خانووەکانیان لەدەستدەدەن، هەروەها بێبازاڕی دەبێتە هۆی کەم بوونەوەی ڕێژەی هاوسـەرگیری، کەمبوونـەوەی ڕێژەی لە دایکبـووان، کە گەنجان ناتوانن پرۆسـەی هاوسەرگیری ئەنجام بدەن بە هۆی نەتوانینیان بەتێچوونی هاوسەرگیری، لەوانەیە زیادبوونو بەردەوامی بێبازاڕی ببێتە هۆی گۆڕینی زۆرێك لە بەهاو مۆڕاڵە باوە کۆمەڵایەتییەکان.

کاتێك کەحکومەت چارەسـەری بێبازاڕی بـکات دەبێتـە هـۆی دروسـتبونی ناکۆکیو پشـێوی سیاسـی، بەم هۆیەشـەوە هاوڵاتیان ئەو باوەڕەیان لا دروسـت دەبێت کەحکومەت ناتوانێـت ژیانێکی کامەرانیان بۆ دابین بکات، هەروەهـا حکومـەت ناتوانێـت بەئەرکەکانی خۆی هەڵسێت، هەرچەندە بێبازاڕی ئەنجامی نێگەتیڤی لەسـەر زۆربەی ئەندامانی کۆمەڵ دەبێت، بەڵام ئەم ئەنجامە نێگەتیڤەی نابێت لەسـەر دەوڵەمەنـدەکانو ئەو کەسـانەی کە کاری حوکومییـان هەیـە، چونکـە بـە هۆی ئەوەی کە بێبـازاڕی دەبێتە هـۆی دابەزینی نرخی شـتومەکەکان ئەمـەش وایان لێدەکات ببنە خاوەنی ئسـوڵی دارایـی، وەك کارگەکان خانوبـەرەکان بە نرخێکـی کەمتر لە نرخی ڕاسـتەقینەی خۆی، هەروەها ئەو کەسـانەی کـە کاری حکومییـان هەیە بە هەمان شـێوە سودمەند دەبن.

## خۆپاراستن لە بێبازاڕی:

زۆربـەی ئابـووری ناسـان پێیـان وایە کەحکومەت دەتوانێت ڕێ لە بێبازاڕی بگرێت ئەویـش بەگرتنەبـەری کۆمەڵێـك بڕیـاری دیاریکـراو کە توانـای تاکەکانـی کۆمەڵ بۆ خەرجی مسـۆگەر دەکات، لەوانەش دەرماڵەی بیمەی کۆمەڵایەتیو کۆمەکی بێکاری، هەروەها ئـەو ئابووری ناسـانە پێیان وایـە کە توانای ئەوان بۆ پێشبینی ئەو ئاڕاستە ئابوورییانەی کە وڵاتان لەسـەری دەڕۆن وا لە حکومەتەکان دەکات کەئـەو بڕیارانـە بگرنەبـەر کەزامنی ئەوە دەکات کە بێبازاڕی ڕوونەدات.

# خۆتان ئامادە بکەن

خۆشەویستانم: تاقیکردنەوەکان نزیکن‌و دوای چەند رۆژێك خەلەو خەرمانی ساڵێك هەوڵ‌و کۆشش‌و ماندووبوونمان کۆدەکەینەوە، بە هیوای دەستکەوتنی ئەنجامی باش دەرگای تاقیکردنەوەکانمان بە روودا والآ دەکرێت.

پێویستە ئێمەش مەردانە خۆمان ئامادە بکەین‌و زیاتر لە رۆژانی پێشوو خۆمان ماندوو بکەین، تا بتوانین بە دڵخۆشییەوە ماڵاوایی لەم ساڵی خوێندن بکەین‌و هەست بە ئاسوودەیی‌و دڵنیایی بکەین.

سەرەتا پێویستە زۆر بە گەشبینییەوە بڕوانینە ئەم وەرزەو ترس‌و لەرزی تاقیکردنەوەکان نابێت بمان ترسێنێت‌و ورەمان بڕوخێنێت، بەڵکو بە هیوای سەرکەوتن‌و بە دەستهێنانی نمرەی بەرزەوە خۆمان ئامادە بکەین.

* کەواتە سەرەتا خۆت لەسەر گەشبینی‌و سەرکەوتن بەرنامەرێژ بکەو بە شێوەیەکی لە بار بیربکەرەوە لە ئەنجامەکان.

* بەرنامەرێژی بۆ کاتەکانت بکەو بۆ پێداچوونەوەی وانەکان کاتو بەرنامە دیاری بکە.

* ئەم چەند رۆژە بۆ تۆ زۆر گرنگن، وریابە دزەکانی کات کاتەکانت ئەدزن.

کاتەکانی دانیشتن‌و میوانداری تا بۆت دەکرێت کەم بکەرەوەو کاتەکانت بە فیرۆ مەدە.

* با بەرنامەکانت زۆر قورس نەبن‌و کاتی پشوودان‌و حەوانەوەش دیاری بکە، چونکە زۆر ماندوو بوون کاردەکاتە سەر چالاکی تۆو وزەو توانات لاواز دەکات.

* بەرنامە دابنێ بۆ پێداچوونەوەی وانەکانت‌و سەرەتا لەو وانانەوە دەست پێبکە کە بە لاتەوە قورسن.

* وا دابنێ ئەم ماوەیە لە حاڵەتی وریایی باڵادایت، دەبێت لەگەڵ خۆتدا کارگێڕیانە مامەڵە بکەیت‌و نەهێڵی کارو بەرنامەکانت بە فیرۆ بچن.

* هەموو رۆژەکانی تاقیکردنەوە چەند رۆژێکە هیچ نابێت ئەگەر هەندێك خۆت ماندوو بکەیت‌و ئارەزووەکانت هەڵبگریت بۆ دوای تاقیکردنەوە.

با بەشێوەیەکی پۆزەتیڤ تەماشای تاقیکردنەوەکان بکەین‌و بە شادمانی‌و گەشبینییەوە بەرەوپیری بچین‌و رۆژانی تاقیکردنەوە وەکو رۆژانێکی خۆش تەماشا بکەین‌و تیایدا ئایندەی خۆمان ببینین.

با لە ئێستاوە ئامادە باشی بکەین بۆ ئەو رۆژانە، لە رووی شوێن‌و پێوستییەکانەوە، وێڕای ئەو خواردن‌و خواردنەوەو چالاکیانەی کە وزەو توانامان پێ دەبەخشن.

لە سەرووی هەموو ئەمانەشەوە پشت ببەستین بە پەروەردگارو داوای یارمەتی‌و سەرکەوتنی لێ بکەین.

زۆریش گرنگە لەم قۆناغەدا بە ورەیەکی بەرزو دەروونێکی هێمنەوە بەیانیان بەرەو هۆڵەکانی تاقیکردنەوە هەنگاو بنێین.

لەگەڵ هیوای سەرکەوتن بۆ هەموو لایەك.

# ئارەزووەکانی ڤیکتۆر هۆگۆ

و: سەروەر عومەر

بەرلە هەموو شتێك ئارەزووی ئەوەت بۆ دەخوازم کەسێکی کۆمەڵایەتی بی و حەز بە تێکەڵاوی دەوروبەرت بکەیت، دەوروبەریش حەز بە تێکەڵاویت بکەن. ئەگەر وانییە، تەنیاییت کورت بێت، لە دوای تەنیاییت ڕقت لە کەس نەبێت... ئارەزوومەندم کە شتی وا ڕوو نەدات... بەڵام ئەگەر ڕوویدا، بزانیت چۆن دوور لە نائومێدی بژیت... هەروەها ئارەزووی ئەوەت بۆ دەخوازم چەند هاوڕێیەکت هەبێ، لەوانە هاوڕێی خراپو ناپایەدار. هەندێکیش ناڕەفیقو هەندێك خۆشەویست، تا لانیکەم بەبێ دوودڵیو گومان یەکێك لە نێوانیاندا ببێتە جێگەی متمانەت... چونکە ژیان بەمجۆرەیە. ئارەزووخوازم کە دوژمنیشت هەبێ، نەکەمو نەزۆر، بە پێی پێویست، تا هەندێکجار بیروباوەڕەکانت بخاتە ژێر پرسیارەوە. بەڵکو یەکێك لەو پرسیارانە لە جێگەی خۆیدا بێت، تا زۆر لە خۆت ڕازی نەبیت... هەروەها ئارەزوومەندم کەسێکی بەسوود بیت... نەوەك زۆر بێ سوود، تا لە ساتە سەختەکانداو کاتێك ئیدی هیچ شتێکت بۆ نەماوەتەوە، هەر ئەم بەسوود بوونەت بەس بێت بۆئەوەی لەسەر پێ ڕاتبگرێت.

هەروەها، هیوادارم ئارامگربی، لەگەڵ ئەو کەسانەدا نا کەهەڵەی بچووك دەکەن، چونکە ئەمە کارێکی سادەیە، بەڵکو لەگەڵ ئەو کەسانەدا کە هەڵەی گەورەو لە قەرەبوو نەهاتوو دەکەنو بە بەکارهێنانی ئارامگرییەکەت، بۆ ئەوانی دی ببیتە نموونە. ئومێدەوارم ئەگەر لاویت زۆر بە پەلە گەورە نەبیت. ئەگەر گەورەشیت، بە زۆر خۆت بە لاو پیشان نەدەیتو ئەگەر پیری، خۆت نەدەی بە دەستی نائومێدییەوە. چونکە هەر تەمەنێك خۆشیو ناخۆشی خۆی هەیەو پێویستە لێگەڕێین بە ژیانماندا تێپەڕێ. هیوادارم نەوازشی سەگێك بکەی، دان بە باڵندەیەك بدەیتو گوێ لە دەنگی کەنارییەك بگری کاتێك لە بەرەبەیاندا دەخوێنێ. چونکە لەم ڕێگایەوە هەست بە جوانی دەکەیت، بەبێ بەرامبەر. هیوادارم تۆوێکیش بە خاکدا بووەشێنی، هەرچەندە ورد بێت... لەگەڵ سەوزبوونیدا هاوڕێ بیت تا تێبگەیت چەندە ژیان، لە درەختێکدا هەیە... سەرەڕای ئەمانەش، هیواخوازم پارەت هەبێت لەبەرئەوەی بۆ کارەکانت پێویستت پێیەتیو بۆ ئەوەی ساڵی جارێك پارەکانت لە بەردەمی خۆتدا دابنێیتو بڵێی: «ئەم پارانە هی منن» تەنها لەبەرئەوەی ڕوونی بکەیتەوە کامتان گەورەی ئەوی دیکەتانە؟! لە کۆتاییشدا، ئەگەر پیاوی هیوادارم ژنێکی باشت هەبێتو ئەگەر ژنیت، هاوسەرێکی باشت هەبێت. ئەگەر سبەینێ ماندوو بوویت، یان دووسبەی شادمان، دیسان هەر باس لە عەشق بکەیت، تا سەرلەنوێ دەستپێبکەیتەوە.

سەرچاوە سایتی: ئاریا بووك.

# ڕێگاکانی گەیشتن بە سەرکەوتن

و: لە فارسییەوە:
مەروان مەزهەر جافر

مەرجی گەیشتن بە سەرکەوتن ئەوەیە کە سەرەتا باوەڕمان بەوە هەبێت کە دەتوانین سەربکەوین، باوەڕی دەروونی زامنی سەرکەوتنی ئێوەیە، لەو کاتەوە کە ئێوە توانای ئەنجامدانی کارێکتان هەبێت، کەواتە شایەنی ئەوەی بگەیت بە ئامانج.

گەورەترین مەسەلەیەك کە زۆرێك لە ئێمە گرفتاریی بووین، ئەوەیە کە لە بوونماندا ئاگری عشقو ئارەزوو بڵێسە نادات، هیچ شتێك ڕێگر نییە لە بەردەم سەرکەوتنی مرۆڤێکی دامەزراوو خاوەن ویستو ئیرادە، ئەگەر بتوانین باوەڕی پێ بێنین هەموو شتێك بۆتان ئاسان دەبێت باوەڕتان هەبێت بە خوا، نەك تەنها لە ڕووخساردا، بەڵکو بە دڵنیاییەوەو لە ناوەڕۆکدا، وەك ڕێنمونیکارێکی خۆتان باوەڕتان پێی هەبێت.

ڕێگاکانی سەرکەوتن:

١- بیرکرنەوەی پۆزەتیڤو لەبارتان هەبێت (دکتۆر نورمن بیل) دەڵێت: بیرکردنەوەی پۆزەتیڤو لەبار هاوشێوەی تیشکی خۆرە لە ناو ژوورێکی تاریکدا، کە هەمیشە شوێنێك ڕۆشن دەکاتەوە.

٢- باوەڕتان هەبێت هەمیشە ئەو شتە ڕوودەدات کە ئێوە لە ڕاستیدا باوەڕتان پێی هەیە، ئەمە سەرکەوتنێکە، کەواتە دەبێت باوەڕانێکی سنووردار کە ڕێگرن لە بەردەم سەرکەوتنی ئێوەدا بناسیو لە ناویان ببەیت.

٣- هەموو ڕۆژێك چاوەڕێی ڕووداوێکی خۆش بکەن، ئەگەر چاوەڕێی ڕوودانی شتێك بن ئەو شتە ڕوودەدات.

٤- بیرکردنەوەکانتان کۆنترۆڵ بکەن، سەرکەوتن لە ڕێگای کۆنترۆڵی تەواوی بیرکردنەوەکانەوە بەدەست دێت.

٥- هەوڵو پشتیوانیتان هەبێت، سەرجەمی سەرکەوتنەکانو خولیاکانو خەونەکانی ئێمە لە ناو گروپێکی سەختی هەوڵداندایە، هەرچەندە زیاتر هەوڵ بدەین سەرکەوتنی زیاتریش بە دەست دەهێنین.

٦- خۆڕاگر بن، ئێمە هەمیشە حەز دەکەین بە زووترین کات بگەینە ئامانجەکانمان لەبەر ئەمەشە لە ژیاندا بێ بڕیارین، جێگیر نین.

٧- یارمەتی کەسانی دیکە بدەن، لە ڕاستیدا ئێوە لە کاتێکدا خۆشبەختو سەرکەوتوو دەبن کە هەست بکەن کە بە یارمەتی دانی کەسانی تر مرۆڤێکی گەورەو بە نرخن.

٨- هزرو زەینی خۆتان لە دوژمنایەتیو ترس ڕەها بکەن، وا هەست بکەن کە هیچ سنورێکتان نییە.

٩- بیر لە باشترین شتەکان بکەنەوە.

١٠- وێنەی ئەو شتە بکێشن کە دەتانەوێت لە ژیانی دەرەوەتاندا هەبێت.

١١- زەوقو خۆشیتان هەبێت (فرانك بتگر) نوسەری کتێبی (چۆن لە کڕینو فرۆشتندا لە ناکامییەوە بگەینە ئاکامی) دەڵێت: مرۆڤ دەتوانێت هەرکات بیەوێت چارەنووسی خۆی بگۆڕێت، لەو کاتەوە دەست پێ دەکات کە بڕیار بدات لە کاری خۆیدا زەوقو خۆشی بەکاربهێنی.

١٢- لە هزری خۆتاندا وێنەیەکی باشی خۆتان بکێشن.

١٣- لە هەڵەو ئامۆژگارییەکانی ڕابردوو پەند وەربگرنو بەرەو پێشەوە بچن.

١٤- متمانەتان بە خۆتان هەبێت، ئەو کات خۆتانتان خۆش دەوێت.

١٥- بەرپرسیارییەتی تەواوی ژیان، ئەوەی کە بۆتان دێتە پێشەوە بگرنە ئەستۆ.

١٦- هەمیشە ببەخشنو فەرامۆش بکەن، بەڵام وەرگرنو لە یادتان بێت.

١٧- لەگەڵ کەسانی سەرکەوتوودا پەیوەندی دروست بکەن.

١٨- ئامانجی خۆتان لە هزرتاندا دوورمەخەنەوە، هەمیشە با لە پێش چاوتان بێت.

١٩- لە واقیعدا بژین، هەموو ڕۆژێك لە بەر خاتری ئەو ڕۆژە ژیان ببەنە سەر.

٢٠- لە هەر کارێکدا تەنها بۆ ئەو کارە چالاکیو هەوڵ ئەنجام بدەن.

٢١- لەگەڵ مرۆڤانێکدا دابنیشن کە خاوەن بیرکردنەوەو کەسایەتییەکی ڕۆحین.

٢٢- لە چالاکیو کارە کۆمەڵایەتییەکاندا بەشداری بکە.

٢٣- هەمیشە بەدوای بەشێکی گەورەدا بن، کە ژیانتان دەگۆڕێت.

٢٤- شەهامەتتان هەبێت، هەر ئەوە بن کە دەتانەوێت، تەنها لەم شێوەدا دەتوانیت سەرکەوتوو بیت.

٢٥- ئارامیو بەردەوامیتان هەبێت، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموێت: (خوداوەند لەگەڵ کەسانێکدایە کە لەبەرامبەر کێشەکاندا دەوەستنو ئارام دەگرن).

٢٦- سوپاسگوزار بە، کاتێك سوپاس دەکەیت ڕۆحی جیهان لە ئێمەدا وزەی بەرز دەبێتەوە، ئەم وزەیە سەرکەوتنەکانی دیکەش بەرەو لای ئێمە کێش دەکات.

سەرچاوە/ ئینتەرنێت/ سایتی مدیریت وتوسعه سازمان و منابع انسانی.

# گۆڤاری بڕیار لە دیدی خوێنەرانیدا

ئا: محەمەد مێرگەیی

**بەڕێز مامۆستا (نەوزاد گەردی) وتارخوێنی مزگەوتی (فیردەوس) لە شاری هەولێر، لە وەڵامی چەند پرسیارێکی گۆڤاری بڕیاردا:**

بڕیار: بیستوومانە بەڕێزتان بە بەردەوامی مانگانە گۆڤاری بڕیار دەخوێننەوە، وەك مامۆستاو زانایەکی ئایینی، چی وای کردووە بایەخ بە خوێندنەوەی ئەم گۆڤارە بدەن؟ سەرەتای ئاشنابوونتان بەم گۆڤارە چۆن بوو؟

مامۆستا نەوزاد: من لە ژمارەی پێنجەوە ئاشنایەتییم بە بابەتو بەهرە جوانەکانی گۆڤاری بڕیار پەیداکردووە، وا لەدوای تێپەڕبوونی دوو ساڵ بەسەر دەرچوونی یەکەم گۆڤاری گەشەپێدانی مرۆیی، دەبینم بڕیار بە بابەتو وێنەو چیرۆكو تەنانەت ڕەنگەکانیشی گفتوگۆ لەگەڵ ناخی مرۆڤ دەکات. هەموو چینو توێژێك خۆی لێ بەهرەمەند دەکات، چونکە باس لە زۆر لە بوارەکانی ژیان دەکات.

بڕیار: بە بۆچوونی بەڕێزتان ئەم گۆڤارە دەتوانێت بە تێپەڕبوونی کات گۆڕانی ئەرێنی لە تاکی کۆمەڵگەی کوردیدا دروست بکات؟

مامۆستا نەوزاد: بێگومان دنیا وایە، هەر کەسێك هەوڵی خۆی بخاتەگەڕ بێ ئومێد نابێت، بە تایبەت ئەگەر ئەم هەوڵە هاوتەریب بێت لەگەڵ ناخو دابونەرێتی ڕەسەنی کۆمەڵگە. بەڵێ بڕیار دەتوانێتو توانیویەتی مرۆڤەکان بە شتە جوانەکان بناسێنێتەوەو فێری ئەوەی بکات ژیانی دونیا زۆر گرنگەو دەبێت بە چاوی ڕۆشنەوە سەیربکرێت. بەڵێ بە تێپەڕبوونی کات گۆڕان لە ناخی تاكو کۆمەڵگەدا دروست دەکات، بەڵام دوای کاتو ئارامی زۆر، چونکە چەندەها بڕیاری تر دراون بۆ دواکەوتنو سەرگەردانی.

بڕیار: بەڕێزتان پێتانوایە کە دەبێت خوێندەواران بە گشتیو مامۆستایانی ئایینی بە تایبەت، گرنگی بە خوێندنەوەی ئەم جۆرە گۆڤارانە بدەن؟ ئایا ئەوەبووە کە لە ڕێگەی بەڕێزتانەوە کەسانی تر بڕیاریان ناسی بێتو پێی ئاشنابووبن؟

مامۆستا نەوزاد: زۆر کەس لە ڕێی منەوە سەرسام بووە بە بڕیارو هەوڵی خوێندنەوەو دەستخستنی داوە، چونکە گۆڤارێکە هێزی کێشکردنی زۆرە، خوێنەران بە گشتیو زانایانی ئایینی بە تایبەتی زۆر ئاتاجی گۆڤارێکی وەهان، چونکە ئەو فێرمان دەکات چۆن لەگەڵ ناخی مرۆڤەکان بدوێین، فێرمان دەکات چۆن لەناو شتە ناشیرینەکان جوانی بدۆزینەوە، ئەگەرچی ئەمڕۆ تەکنەلۆژیا بە شێوەیەکی باش بەرەوپێش چووە، بەڵام ناخی مرۆڤ بە ڕێژەی ئەوان گەشەی نەکردووە، هێشتا پەیوەندی مرۆڤەکان، دیدگای مرۆڤەکان لە دواوەن، بۆیە بڕیار دەتوانێت خوێنەرانی خۆی ئازا بکات کە بڕیاری گۆڕان بەرەو باشتر بدەن.

بڕیار: ڕەخنەو پێشنیاری بەڕێزتان بۆ گۆڤاری بڕیار چییە؟

مامۆستا نەوزاد: هیچ شتێکی مرۆڤ بێ کەموکوڕی نابێت، بۆیە جارجارە وا هەست دەکەم لە ڕێچکەی خۆی لابدات بە زۆربوونی چیرۆکەکانو وەکو گۆڤارێکی ئەدەبی دێتەپێش چاو، هەروەها وێنەکان زۆر گەورەن. پێشنیاردەکەم کە زیاتر گرنگی بە گەشەپێدانەکە بدەنو ژمارەی لاپەڕەکانیش زیاد بکرێت، ئومێد دەکەم ئەم گۆڤارە لایەنەکانی تری ڕاگەیاندن بگرێتەوە، وەکو ڕادیۆو TVو کۆڕو سیمینار...، لە کۆتاییدا نزای خێرتان بۆ دەکەمو سوپاستان دەکەم.

بڕیار: لەگەڵ سوپاسی ئێمەش بۆ پێدانی ئەم کاتو دەرفەتەی بەڕێزتان.

# باوەڕ سەرچاوەی بەختەوەرییە

ئاواز سەلیم سابیر - تەکیە

دەگێڕنەوە پیاوێك لە خێزانەکەی توڕەبوو وتی: بەڵێن بێت دەبێت بەد بەختت بکەم، خێزانەکەشی بە ئارامییەوە وتی: تۆ وەك چۆن ناتوانیت بەختەوەرم بکەیت، بە هەمان شێوە ناشتوانی بەد بەختم بکەیت!

پیاوەکە زۆر توڕە بوو وتی: چۆن ناتوانم؟ خێزانەکەی هیچ خۆی تێك نەداو بە هێمنی وتی: ئەگەر بەختەوەری لە دەرماڵەدا بێت دەتوانیت بیبڕیت... ئەگەر لە خشڵو زێڕو زیودا بێت دەتوانیت بێبەشم بکەیت... کەواتە پێویستە ئەوە بزانیت کە بەختەوەری من لە شتێکدایە، کە لە ژێر دەسەڵاتی هیچ کەسێکدا نییە، تەنانەت تۆش!

هاوسەرەکەی بە سەرسوڕمانەوە پرسی: ئەو شتە چییە؟

خێزانەکەی دیسان زۆر بە هێمنیو لەسەرخۆییەوە وەڵامی دایەوەو وتی: بەختەوەری من لە باوەڕمدایە، باوەڕیشم لە دڵمدایە، دڵیشم تەنها لە ژێر دەسەڵاتی پەروەردگارمدایە!!!

سەرچاوە/ کتێبی (خۆتو کەسانی تر بەختەوەر بکە).

# ڕێگە بدە نوری ناخت هەڵبێت

لە شارێکی بچووکو دوور، لاوێك دەستی دایە کارە تایبەتەکەی: ئەو بازرگانی بە شتومەکی هەرزانەوە دەکرد لە گۆشەیەکی نێوان بە یەکگەیشتنی دوو شەقامدا، ئەو گەنجێکی دەستپاکو بڕواپێکراو بوو، لە لای هەمووان خۆشەویست بوو، کەلوپەلەکانیان دەکڕیو لە هەمان کاتیشدا باسی ئەم لاوەیان بۆ کەسانو هاوڕێیانیان دەکرد تا ئەوانیش بۆ کڕینی پێداویستییەکان بچن بۆ لای، ئەوەش بووە هۆی ئەوەی کارەکەی گەشە بکاتو شوێنی فرۆشتنی شمەکەکانی گەورەتر بکات، لە ماوەی چەند ساڵێکدا تەنها بازرگانییەکەی بووە چەند زنجیرەیەك کە درێژەی کێشاو لە کەنارەکانی ڕۆژهەڵاتەوە گەیشتە کەنارەکانی ڕۆژئاوا...

بەتێپەڕ بوونی ساڵ ئەم لاوە بووە خاوەنی ماڵو منداڵو سەروەتو سامانی بێ شومار، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕۆژگارەکانی ژیان کە بەسەر تەمەنیدا تێدەپەڕی، ئەویان بەرەو بە ساڵاچوونو دەردی پیری کرد... ڕۆژێکیان تەندروستی تەواو نەبوو، ئازار زۆری بۆ هێنا، نەوەکانی زۆر بە خێرایی گەیاندیانە نەخۆشخانە، پزیشکەکان دوای پشکنین بۆیان دەرکەوت کە لە دوا ساتەکانی تەمەنیدایەو پێدەچێت بەم زووانە دڵە پاکەکەی لە لێدان بکەوێتو بۆ دواجار ماڵئاوایی لە دۆستانو ئازیزانو خۆشەویستانی بکات!

دوای ئەوەی لە ئاماژەی پزیشکەکان تێگەیشت، بانگی هەر سێ کوڕەکەی کردو پێشنیارێکی خستە بەردەمیانو پێی وتن: یەکێك لە ئێوە دەبێتە سەرۆکی ئەو کۆمپانیایەی کە چەندین ساڵە بنیاتم ناوەو لە پێناویدا ئەرکو ماندووبوونی زۆرم چەشتووە، بۆئەوەی بڕیاری بوون بە سەرۆك بۆ شیاوترینتان بدەم، بڕی سەد دۆلار دەدەمە هەریەکێکتان ئەمڕۆ بچن هەرشتێك کە دەتانەوێت بەو سەد دۆلارە بیکڕنو ئێوارە بگەڕێنەوە بۆ ئەم نەخۆشخانەیە، بە مەرجێك ئەو شتەی کە ئێوە بەو بڕە پارەیە دەیکڕن پێویستە هەموو لاو قوژبنێکی ئەم ژوورە بگرێتەوەو پڕاوپڕی بێت!!

ئەم بیرۆکەیە کوڕەکانی سەرسام کردو هەریەکەیان بە لای کاری خۆیەوە چوو، بڕی سەد دۆلارەکەیان خەرج کرد بە مەبەستی کڕینی ئەو شتەی کە باوکی داوای لێ کردبوون، کاتێك ئێوارە گەڕانەوە باوکی لە کوڕی یەکەمی پرسی؟ چیت کرد بە سەد دۆلارەکە؟

وتی: بابە گیان من چوومە کێڵگەی یەکێك لە هاوڕێکانم، دوو فەردە (کا)م لێکڕی، کاتێك کوڕەکە لە ژوورەکە چووە دەرەوەو دوو فەردەکەی ئامادەکردو هەڵی وەشاندن هەموو (کا)کەی بەهەوادا بڵاوکردەوە لەماوەی خولەکێکدا ژوورەکە پڕبوو لە کا، بەڵام پاش ماوەیەکی کەم هەمووی کەوتە سەر زەوییەکە، بەڵام هەموو ژوورەکەی نەگرتەوە وەك ئەوەی کە باوکی ویستی.

پاش ئەو لە کوڕی دووەمی پرسی: تۆ چیت بە سەد دۆلارەکە کرد؟

وتی: بابە گیان، چوومە فرۆشگەیەكو دوو سەرینم کڕی کە ناوەکەی پڕن لە پەڕی باڵندە، ئەویش سەرینەکانی بۆ هێناو پەڕەکانی بە ژوورەکەدا بڵاوکردەوە، بە هەمان شێوەی براکەی هەموو ژوورەکە پڕبوون لە پەڕو پاشان لەسەر زەوییەکە مانەوە، واتە ئەمیش پڕاوپڕی ژوورەکەی نەگرتەوە.

نۆرەی کوڕی سێیەم هات، بەویشی وت: ها کوڕم ئەی تۆ چیت لە پارەکە کرد؟

ئەویش لە وەڵامدا وتی: بابە گیان ئەو سەد دۆلارەی لێتم وەرگرت بردمە فرۆشگەیەك وەك ئەو فرۆشگەیەی چەندین ساڵە تۆ بنیاتت نابوو، سەد دۆلارەکەم دایە خاوەن فرۆشگەکەو داوام لێکرد کە بۆم ورد بکاتەوە، پەنجا دۆلارم لێ دا بە دوو ڕێکخراوی خێری شارەکەمان، بیست دۆلاری ترم بەخشییە خێزانێکی هەژار، پاشان دوو شتم کڕی، دەستی کردە گیرفانیو پاکەتێکی شقارتەو مۆمێکی بچووکی دەرهێنا، پاشان مۆمەکەی داگیرساندو ئەو گڵۆپانەی لەو ژوورەدا هەڵکرابوون کوژاندنییەوە، ژوورەکە نە بە پەڕ نە بە کا پڕ نەبووەوە، بەڵکو ڕووناکی سەراپای ژوورەکەی گرتەوە!

باوکی بە کاری کوڕی سێیەمی زۆر خۆشحاڵ بوو، وتی: ئافەرین کوڕی خۆم، تۆ دەبێتە سەرۆکی ئەو کۆمپانیایە، چونکە تۆ وانەیەکی گرنگت لە ژیان زانی، دەزانیت چۆن نوری خۆت هەڵبکەی، ئەوەش کارێکی زۆر گرنگە.

سەرچاوە: کتاب شوربە دجاج للحیاە العملیە

ئا/ بێخەرد فارس

# با وەك هەنگ بژین

هێمن ئەحمەد ڕەسوڵ

بێگومان ئەگەر لە ژیانی هەنگ وردبینەوە دەبینین کە چۆن هەموو کەسێك خۆشی دەوێت و سوودی لێ وەردەگرێت، کەواتە با هەمووومان هەوڵبدەین وەکو هەنگ هەمیشە شیرینی ببەخشین، با لە ژیانی هەنگ تێ بگەین:

١- هەنگ تاکو دوا چرکەی ژیان کار دەکاتو هەمان هێزی گەنجی هەیە هەرگیز ناڵێت ماندوو بووم سەرەڕای تەمەن کورتی.

٢- بەکۆمەڵ ژیان بەسەر دەبەن بە یەکەوە خۆراکی زستانە زیاد لە پێویست کۆ دەکەنەوە.

٣- هەموومان دەزانین هەنگ پێوە ئەدا، بەڵام سەرەنجام خۆی دەمرێت واتە هەرگیز زیانبەخشیان لە ناودا نامێنێ.

٤- بەردەوام پاسەوانێك یان دووان بەرگری لە شانەکەیان دەکەن ناهێڵن بێگانە بچێتە ناو شانەکەیانەوە.

٥- ڕاستە هەنگ دوژمنی زۆرە، بەڵام گەر ئازاری نەدەیت هەرگیز ئازاری کەس نادات.

٦- هەنگ هیوا بڕاو و وەڕەز نابێت، گەر لە گوڵێکدا شیلەی دەست نەکەوت سەدان گوڵی تر دەگەڕێت.

٧- هەنگ دەرفەت لەدەست نادات گشت رۆژێکی بەهارو هاوین بەوپەڕی گەشبینییەوە لەشانەکەی دەردەچێت، دەزانێ بەهار کە ڕۆی ناگەڕێتەوە، بۆیە بەهاران دەرگای شانەکەیان فراوان دەکەن بۆ هاتووچۆ زستانانیش لە ترسی سەرما بچووکی دەکەنەوە.

٨- چەند لە دەستی بێت خۆراك کۆ دەکاتەوە ناهێڵێ لە خۆبایی بوونو تەممەڵی ڕێی لێ بگرێت.

٩- هەنگ بە دەم شیلە دەمژێ بە قاچەکانی هەڵاڵە کۆ دەکاتەوە بە باڵەکانی دەفڕێت بە چاوەکانی ڕێگا دەبینێت بە چزووەکەی بەرگری لە خۆی دەکات، واتا بە گشت ئەندامێك کار دەکات.

١٠- هەنگ هەمیشە سەرکردەیەکیان هەیە کە پێی دەڵێن (شاژن) دەیپارێزنو خۆراکی ئامادەکراوی پێ دەدەن، گەر هاتوو توشی لە ناوچوون هات ئەوا سەرکردەیەکی نوێو کارامە دروست دەکەن هەمان خۆشەویستیان بۆ دەبێت.

١١- بەرهەمی ماندووبونی هەنگ هەنگوینە ئەو هەنگوینەی کەس لە خواردنی تێر نابێت با بەرهەمی ئێمەش شیرین بێت.

١٢- هەنگ ئەندازیارە لەرێکخستنو جوانکاری زۆر بە توانایە سەیری شانەکانی بکە بە چ ئەندازەیەك ڕێکیخستوون.

## وانەیەك بۆ ژیان

نیوەی تەمەن بە سەر دەبەین
بە دوای سەروەتو سەرکەوتنو ناوبانگدا،
نیوەکەی تریشی بە شوێن پزیشکدا!

# ڕێگاکانی سەرکەوتن بۆ ژیان

شوان رابەر

دەستپێك: لەبەرئەوەی لە هەموو کاروبارەکانی ژیاندا خەڵکی هەوڵی سەرکەوتن دەدەن، سەرکەوتن بە سروشت داخوازییەکی زۆر گرنگو پێویستو چارەنووسسازە، بە پێویستی دەزانم بۆبردنەوەو سەرکەوتن لە کارەکانو ژیانماندا، هەندێ لەم ڕێگاو شێوازانە بخەینەڕوو، بە مەبەستی سوود لێوەرگرتنو پراکتیزە کردنیان:

یەکەم/ پێناسەی سەرکەوتن: بریتییە لە زاڵبوون بەسەر ژیانو کاروبارو گرفتو بەرامبەرەکاندا، بە دەست هێنانی دەرەنجامێکی باشی خوازراو.

دووەم/ گرنگی سەرکەوتن: بێگومان سەرکەوتن لە ژیاندا شتێکی زۆر گرنگو پێویستو داواکراوە، بەرهەمەکەشی زۆر شیرینە.

سێیەم/ ڕێگاکانی سەرکەوتن:

١- نیاز پاکیو دڵسۆزیو دەستپاکی لە کارکردندا.

٢- لە خواترسانو پەرستشو گوێڕایەڵی کردنی.

٣- پشت بە خوا بەستنو لەسەر پێی خۆ وەستان.

٤- دڵنیابە هیچ شتێ بێ یارمەتو کۆمەکی خودا نابێو ناکرێ.

٥- بڕوابوون بەخودو بە سەرکەوتن، بە پەرۆشەوە کارکردن بۆ سەرکەوتن.

٦- جەسووریو بوێری بەدی بێنە، لێبڕاوانە کاربکە بە دیسپلینو ڕێککاری.

٧- خاڵە لاوازەکانت لەناو ببە، پەرە بە خاڵە بەهێزەکانت بدە.

٨- هەمیشە گەشبین بەو هیچ کات رەشبین مەبە.

٩- واقیع بینیو تازەگەری.

١٠- ویژدانی چاكو بەهێز لە دڵ و دەروونو لە کرداروگوفتارتدا دروست بکە.

١١- ڕای چاك هۆی سەرکەوتنە، ڕای خراپیش هۆی هەرەسهێنانە.

١٢- هەمیشە بیر لەوە بکەرەوە کە بەختەوەرو سەرکەوتوت دەکات، دوور بکەوە لەوەی کە دوو دڵو لاوازو توشی شکستت دەکات.

١٣- بڕوابوون بە بەرنامەو هۆکارەکانی کارکردن و دابین کردنیان.

١٤- باش بیربکەوەو پلان دابڕێژەو هەنگاو بنێو ڕێگاو هۆکارەکانی کارو ژیانت باش بناسە.

١٥- بە پێی نەخشەی دیاریکراو کاربکەو هەنگاوبنێو، هەلو کات بقۆزەوە.

١٦- بیرو بۆچوونەکانت راستەڕێو تۆمار بکە.

١٧- لە کاتی گونجاودا پشوو بدە.

١٨- پەیوەست بوون بە کارەکانتو بە سەرکەوتن بپارێزە.

١٩- کاریزمابەو سەرنجی خەڵك راکێشە.

٢٠- کاری خۆتو خەڵکانی تر بە کەمو بە زۆرمەزانە.

٢١- خۆت بە خەڵکی بەهێزو چالاك بەراوورد بکە، نەك بە خەڵکی لەڕو لاواز.

٢٢- پشتکردنە ئەو کەسانەی دوو دڵت دەکەن لە سەرکەوتن، هیواو ئاواتەکانت دەمرێنن.

٢٣- هاوکاری خەڵك بکەو هاوکاری لە خەڵك وەربگرە.

٢٤- ڕێگە نەدان بە دزەکردنی سیخوڕان بۆ ناو کارو ریزەکانت.

٢٥- کۆڵ مەدە تا سەرکەوتن، بزانە هەموو گرفتێك چارەسەرو کلیلی خۆی هەیە.

٢٦- ژێرکەوتنی بە هیواو ئاوات سەرکەوتنە.

٢٧- پەند لە ڕابردووی خۆتو خەڵك وەربگرە.

٢٨- لە ژێرکەوتنو نسکۆو کێشەکاندا بە چۆکدا مەیەو هەستەوە.

٢٩- لە هەموو بوارێکەوە هەمیشە هەوڵی دروستکردنی خۆتو خەڵك بدەو کەسێکی بەکەڵك بە بۆ کۆمەڵ.

٣٠- بۆ هەموو کاروبارەکانی ژیانت نەخشەو بەرنامەی ڕێگاو کارنامەو لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنو پرسو ڕاوێژو سەرنجو تێبینیو موتابەعەو موحاسەبەو سزاو پاداشتو کۆڕو کۆبوونەوەو بە سەرکردنەوەو... هتد، هەبێت.

گوڵان حەمە ئەمین

# پەشیمانم
## لە هەر فرمێسکێك كە هەڵم وەراند!

ئـەو کاتەی ناسـۆرییەکانی ژیان پڕ بەجانتاکەی شانم ناخۆشیو پڕ بە قاپی سەرسـفرەکەم خـەمو پڕ بـە ماڵەکەم ئـەرکو چەنـد هێنـدەی بـاڵای خـۆم بەرپرسیاری  بۆکردمە دیاریو پێشکەشی کردم، تەمەنم (٧)ساڵان بوو، هەر ئەو کاتە بە پەلە لەسـەر یاریکردنی بوکەڵەکانم بانگیـان کردم لەوە بـەدواوە نەچومەوە بۆیـاری کـردن، خوشـكوبرا بچوکەکەم جێـگای بووکەکانیان بۆگرتمـەوە، یاری ماڵەباجێنەکەشم بوو بە ڕاستو چێشتی خێزانێکم ئامادە دەکرد، لە باتی جانتای قوتابخانـەش هەموو ڕۆژێك کۆڵێك جلم دەبرد بۆشـتن، بەڵام هەموو بەیانییەك دەچومە بەر دەرگاو تا ئەسـرین لەسەر ڕوومەتەکانم ڕێچکەی دەبەست چاوەکانم دەبڕییە دیمەنی ئەوکچە دراوسێیەمان کە خۆزگەم پێ دەخواست ئەو کاتانەی دایکی بەڕێی دەکرد بـۆ قوتابخانەو جانتاکەی دەکردە شـانیو ماچێکی دەکـردو تا لە کۆڵانەکـە دیارنەدەما بای بایی بۆدەکرد، لە گەرمەی کارەکانیشمدا دەچووم ماچێکی بوکەڵەکانمو سەرپۆشەکەی دایکم دەکرد کـە لە ناکاو لەگەڵ یەکەم گریانی هاتنە دونیای خوشـکەکەم بـە هاوارێکی پڕلە ئازار سەفەری مەرگی کردو خوشکەکەمی بە دیاری بۆجێهێشـتم، هەتا چێشـتێکم لێدەنا نیوەیم دەڕشـتو دەستم دەسوتاو مشـتێ فرمێسکیشـم هەڵدەوەراند، لەو ڕۆژە بـەدواوە من لە جێـی دایکم ماڵم بەڕێوەدەبرد، پاش دووساڵ باوکیشم ژنی هێنایەوەو منیـش جگە لە کۆڵێ خەمی تـر هیچم بۆ زیـاد نەبوو! تا ئەو کاتەی تەمەنـم بوو بە (١٧) سـاڵ من لەم ژیانە بێنـازە بەردەوام بووم، بەڵام نەم دەزانی کە مـن بوومەتە چیایەك لە خۆڕاگریو توانـای ڕووبەڕووبوونـەوەو ڕاوەسـتانم بەرامبەرهەموو کێشەکانم هەیە، بڕیارمدا چۆن ئەمانەتەکەی دایەگیانم پاراسـتو بوومـە دایك بۆخوشـكو برابچوکەکەمو نەمهێشـت بێ نازییان پیادەرکەوێتو لە پێناویاندا ژیامو ئەو ئاواتەی دایکیشم کە نەهاتەدی بەدی بهێنم، ئەویش ئەوەبوو کە دەسـتم کردەوە بـە خوێندن، هێندە گورزی ناسـۆرم لێدرابوو بە وێنەی پۆڵا بەهێـز ببووم، هیچ شـتێك چۆکی پێدا نەدەدام، زۆربە سەرکەوتوویی قۆناغەکانی خوێندنـم تەواوکـرد، لـە بەرئەوەی لە تەمەنی (٧)ساڵییەوە وەك گەورە مامەڵەم دەکرد ئـەو ئەزمونـەی خەڵکانی تر لە دوای گەورەبوونـی منداڵەکانیـان بـە دەسـتی دەهێنن من پێش ئـەوەی ببمە دایك بە دەسـتم هێنابوو، بەڵام هەر ئەو کچەنـازدارەی هاوڕێم کە هەموو ڕۆژێك دەگریـام بۆئـەوەی کە وەك ئـەو نازیم نـازداریو نەچەشـتنی ئازارەکانی ژیان وەك گوڵی بەرسـێبەریان لێکردبوو هەر زوو چۆکی بۆ کەمترین ئاسـتەنگی ژیان داداو هیچ سـەرکەوتنێکی لەسەر شانۆی ژیان تۆمـار نەکرد، ئێسـتا ئەو خۆزگە بە من دەخوازێت، هەر بۆیە پەشـیمانم لە هەرفرمێسـکێك کـە هەڵـم وەراند، گەردەمزانی هەرچرکەیەك لە ئازارەکانی ژیـان مامۆسـتایەکەو وانـەی ژیانـم فێـردەکات، بێگومان بۆ هەرئاسـتەنگو ناڕەحەتیو کێشـەیەك زەردەخەنەیەکم دەکردە دیـاری، چونکە لێدانەکانی ژیان وەك لێدانی دایكو باوك وایە، بۆیە لێمان دەدەن تا فێری ژیانمان بکەن...

# سەرچاوەی مرۆیی

سەرچاوەی مرۆیی یەكێكە لە سەرچاوەكانی بەردەست حكومەتانو دەوڵەتان، وەك هەرسەرچاوەیەكی تر، نموونەی سەرچاوە سروشتییەكان (نەوت، كانزاكان، سەرچاوە ئاوییەكان)، بەڵام ئەمەیان لەوانی تر لە پێشترە، چونكە بێ سەرچاوەی مرۆیی مەحاڵە بتوانرێت سود لە سەرچاوەكانی دی وەربگیرێت، (دیارە پاش پۆلێن كردنو راهێنانیان بەشێوەكی پێویستو دروست)، بەشێوەك هەندێ وڵاتان سەرچاوەی سروشتی ئەوتۆیان نییە، بەڵام بە هۆی كۆمەڵێك سەركردەی لێهاتوو و دەزگای چالاك و تۆكمەوە توانیویانە ئابورییەكی پتەو بنیات بنێن و خۆشگوزەرانی بۆ دانیشتوان دەستەبەر بكەن، تایلاندو یابان، نموونەی ئەو وڵاتانەن.

واتای سەرچاوەی مرۆیی: لە لایەك پەیوەستە بە دانیشتوان، لە لایەكی دی پەیوەستە بە ئابوریو كاروبەرهەم هێنانەوە. لێرەدا سەرچاوەی مرۆیی ئەو كەسانەن قۆناغی منداڵییان تەواو كردووەو گەیشتوون بە قۆناغی پیری، واتە سەرچاوەی مرۆیی بریتییە: توانای كاركردن، ئەو هێزەی توانایی كاركردنو بەرهەم هێنانی هەیە، (بەرهەمی شمەكو خزمەتگوزاری). بەم شێوەیە هێزی كار دوو تایبەتمەندی تێدایە: تەمەن، توانای كاركردن، كەواتە سەرچاوەی مرۆیی ئەو تاكانەن توانای كاركردنیان هەیەو قۆناغی منداڵییان تەواوكردووەو لە رۆژانی پیریدان یان بەرێوەن بەرەو ئەو رۆژگارە.

لەم ناساندنەوە چەند ناروونییەكمان بەرچاو دەكەوێت بریتین لە:

١- دیاریكردنی ئەو ساڵانەی بە كۆتایی رۆژانی زارۆكی دێنە ئەژمار: یاسای هەندێ لە كۆمەڵگاكان كۆتایی ئەم رۆژانە بە دەساڵ دەخەملێنن، هەندێك درێژی دەكەنەوە بۆ هەژدە ساڵ، برێكی تریش نێوەندی ئەو دوو مێژووەیان بەلاوە پەسەندە، تێرامان لەسەر ئەم مێژووانە بە شێوەیەكی گشتی پەیوەستە بە گۆرانی كۆمەڵایەتییەوە، دیارترینی ئەم لایەنەش بەرەو پێشچوونی ئابوریو دیاردە كۆمەڵایەتییەكانن. بە هەڵكشانی ئەم دوولایەنە دەستنیشان كردنی رۆژانی ئەم قۆناغە كەم دەبێتەوە. پاشان رێگەدان بە كاركرنو تاقەتی شول كردنو بەرهەم هێنان دەردەكەوێت لە كۆتایی ئەم مێژووەدا.

٢- دەستنیشان كردنی ئەوانەی

و: وەهاب حەسیب محەممەد

تواناى كاركردنيـــان لاواز دەبێت: زۆربەى كۆمەڵگاكان ســاڵانى خانە نشــينى ديارى دەكــەن بــە دەيەى شەشــەمى تەمەن (لە كەرتى گشتيدا)، بەڵام لە كەرتى تا يبەتدا مرۆڤى ئيشــكەر تا سەرووى ئەم تەمەنە دەســتبەردارى كاركردن نا بێــت، خاوەن پــرۆژە تايبەتييەكان كە لەســەر باخەڵى خۆيان ماندوو دەبن تا ســاڵانێكى دوورتر دەستبەردارى كاركردن نابن، ديارى كردنى دوا رۆژەكانــى كاركــردن پەيوەســتە بە: قازانجى ئابورى و سودى كۆمەڵايەتييەوە، سەرەڕاى پاشەكشەى تواناى هزرىو لاشەيى تاكى كاركەر.

٣- تێكــەڵ بــوون لەگــەڵ هەنــدێ دەســتەواژەى تــردا: وەك دەســتەواژەى هێــزى كار، توانــاى مرۆيى، لــە كاتێكدا هێزى كار بەشــێكە لە تواناى مرۆيى ئەو تواناياناەى لــە دەرەوەى هێزى كارن چون ئامادەنەكــراون ياخود گــەڕان بە دواياندا نەكراوە بە مەبەســتى خســتنە گەڕيانو ســودمەند بوون لە وزەو توانايان، تواناى مرۆيــش بەو كۆمەڵە خەڵكــە دەگوترێت كە توانــاى كاركردنيان هەيــە لە لايەنى تەمەنو تواناوە.

ســەرچاوەى مرۆيــى: كۆمەڵێــك تاكــى لێهاتووى شــياون، خــاوەن تواناى گونجــاون بــۆ بەجێهێنانــى جۆرەها كار، ئارەزومەنــدن ئەم كارانــە تەواو بكەن بە باوەڕو گوڕوتينەوە.

لــەم پێناســەوە دەگەينــە چەنــد ئەنجامێك كــە دەتوانين تاقەتى كارپۆلێن بكەين بەم شێوەيە:

أ- ئــەو تاكانەى توانــاى كاركردنيان هەيە لە ئاســتێكى دياريكــراودا بەدەر لە پلەى لێهاتويانو تايبەتمەنديان.

ب- هێزى كاركەر بەشــێوەيەكى گشتى تەمەنيان لە نێوان (١٥-١٦ بۆ ٦٥) ساڵيدايە.

ج- لەم دەستەواژەيەدا ئەم كۆمەڵانە بەدەرن: منداڵان، تاكى هێزەچەكدارەكان، پەككەوتەكان، بەندكراوەكان، خانەنشينانى هــەردوو بــوارى ســەربازىو مەدەنــى، قوتابيــان، ئافرەتانى مــاڵ و ئەو تاكانەى ئارەزووى كاركردنيان نييە.

پۆلێن كردنى سەرچاوەى مرۆيى:

١- رەگــەز: زۆربــەى كارى رۆژانــە رەگــەزى نێر يــان رەگەزى مــێ پيادەى دەكات، هەنــدێ كار هەيــە زياتر گونجاوە بۆ يەكێك لە رەگەزەكان، بەشــێك لە كار رەگەزى پياوان ئەنجامى نادەن، چونكە بە كارى ئافرەتانى دەزانن، هەمان بۆچونيش لاى ئافرەتان بەرچاوە، وەك ديارە ئاســتى بەشــداريكردنى رەگــەزى نێــر زياترە لە چالاكــى كۆمەڵايەتىو ئابوريدا لەم پۆلێن كردنەوە دەگەينە ئەو ئەنجامەى پێويستە ســەرچاوەى مرۆيى پۆلێن بكرێت بەسەر هــەردوو رەگــەزدا، لــەڕووى داواكارىو دابەشكردنو پيشــاندانى وەك هێزى كارو بەرهــەمهێنان.

٢- رادەى بەشدارى چالاكى كۆمەڵايەتىو ئابــورى دەگۆڕێت بە پێى تەمەن، هەندێ دەسڕەنگينى، چالاكى كۆمەڵايەتىو ئابورى پێويســتيان بە تەمەنى دياريكراوە، كارى ســەنگين پێويستى بە تەمەنى لاوە، بەڵام هەندێ كارى پسپۆڕى داخوازى شارەزايىو تەمەنى هەڵكشاوترە، پێويستە سەرچاوەى مرۆيى بەسەر جۆرى تەمەندا دابەشبكرێت بە شــێوەيەك بەديهێنــەرى ئامانجەكانى نەخشەكێشانى بێت.

٣- ئاســتى خوێنــدەوارى: فێربــوون بە هەموو شێوەو ئاستەكانييەوە ئامادەكارييەكە لــە بــوارى كارو ژيانــدا، هەموو پيشــەيەك پێويســتى بــە راهێنانو فێربــوون هەيە لە ئاســتێكى دياريكــراودا، ئــەم پەيوەندييەى نێــوان كاركــردنو فێربــوون دەخوازێت بە پۆلێن كردنى ســەرچاوەى ئادەميزاد بەپێى ئاستى خوێندەوارى، تا بەشێوەيەكى گونجاو ئامــادە بێت بە مەبەســتى نەخشەكێشــانو دابەشــكردنى بــە پێــى ئــەو ئاســتەى لە توانايدايە.

پيشە: ئەوجۆرە كارانەيە سەرچاوەى مرۆيى لە توانايدايە رێكيان بخات بريتييە: لە كۆمەڵێك زانيارىو شــارەزايى ســادە يا ئاڵۆز بێت، جۆرەها جياوازى دەردەكەوێت لــە پيشــەيەكەوە بۆ پيشــەيەكى دى، كە جۆرەكانى بە شێوەيەك بەربڵاوە مەحاڵە بتوانرێــت لــە ليســتێكدا كۆبكرێنــەوە. بۆنموونە (رێكخراوى كارى عەرەبى ســاڵى ١٩٨٩) پيشەى دابەشــكردووە بەسەر پێنج دەستەى جياوازدا:

أ- دەستەى هونەرى.

ب- دەستەى كرێكارى شارەزا.

ج- دەستەى كرێكارى پيشەيى.

د- دەستەى شارەزايان.

ه- دەســتەى كرێكارانێــك توانايــان دياريكراوە.

رێكخســتنى مەوســوعەى (كومبتونى ئەمريكــى) پيشــەو كارى دابە شــكردووە بەسەر ٢١ جۆر، وەك فەرمانبەرە گەورەكانو پياوانــى بەڕێوبەرايەتى (رجــال الإدارە)و بەڕێوەبەرەكان... هتد.

گرنگيدان بە سەرچاوەى مرۆيى: ئەو بارودۆخــەى ئەمــڕۆ وڵاتانى پيشەســازى پێشــكەوتوو وڵاتانــى جيهانى ســێيەم لە رووى بەڕێوەبردنــەوە پێــى گەيشــتون دەرئەنجامــى چەنديــن گۆڕانكاريــن لــە بوارەكانى: ئابورى، ڕاميارى، كۆمەڵايەتى، هەر يەكێكيان كاريگەرى بەســەر كۆمەڵگا پاشان بەڕێوەبردنەوە هەبووە.

١- وەڵامدانــەوەى كێشــەكانى پيشەســازىو شارســتانييەت. ســەرەتاى دەركەوتنى دامەزراندنى تاك بەشێوەيەكى دروســت بــەر لە شــەڕى يەكەمــى گێتى لــە كاتى گەشــەى ئابورى پشەســازيدا لە ويلايەتەيەكگرتــوەكان دەركــەوت، كاتێك هەندێك لە خاوەن كارەكان هەســتيان بە گرانى كێشە دەروونىو كۆمەڵايەتييەكانى كارگەران كردبوو، كە دەرئەنجامى شۆڕشى پيشەسازى بوون وەك: لاوازبونى پەيوەندى كۆمەڵايەتــىو مرۆيــى نێوان كرێــكاران، بڵاوبوونەوەى جۆرەها نەخۆشى دەروونى وەك: بێزارى، بێتاقەتى... هتد.

سەرەڕاى دڵڕەقى سەرپەرشتيارانو كەمى كرێــى رۆژانەيان، ئــەم هۆكارانــە ويژدانى هەندێــك لــە خــاوەن كارەكانى جــوڵان بە مەبەستى كەمكردنەوەى ئەو بارە ناهەموارە هەســتان بە هەندێ چاودێرى باوكانە وەك: پێدانى قەرز بە كرێكاران لە كاتى پێويستدا، كردنــەوەى خولــى فێربوون بە مەبەســتى بەرزكردنــەوەى توانايــى بەرهەمهێنــانو خۆشەويســتى كار لــە لاى كارگــەران. هەندێكيان لەوە زياتر رۆيشــتن ئەوەش بە دانانى چاودێرى كۆمەڵايەتى لە كارگەكاندا.

٢- داهێنــان لــە بــوارى ياســا حكوميەكاندا: حكومەتى ئەمريكا ســاڵى ١٩١٠ لــە بــوارى تاكدا گەشــەى بە چەند ياســايەك دا لەو بوارەدا، وەك رێكخستنى كاتژمێرەكانــى كاركــردن، موچــەى رۆژانــە، بارودۆخــى كاركــردن، هەروەها قەرەبوكردنەوەى بريــنو ئێش لە ماوەى كاركردنــدا، ســەرەڕاى داهێنانــى بيمەى كۆمەڵايەتى.

٣- سەنديكا كرێكارييەكان: لە ئەنجامى شۆڕشــى پيشەســازيداو بــە مەبەســتى قازانــج چەندين فابريقــە دامەزرێندران كەبوونە هــۆى كۆبوونــەوەى ژمارەيەكى زۆرى كرێكاران لە جێــگا دياريكراوەكاندا (كارخانەكان).

كارگــەران بەو شــێوەيە خۆيان بينى ئەو باوەڕەيان لا چەســپا هەســت بەهێزو توانايى خۆيان بكەن، لە كۆتاييدا هەستان بەدروســتكردنى ســەنديكا بە مەبەســتى داواكــردنو بەدەســتهێنانى مافەكانيــان، وەك: لێكۆڵينــەوەى داواكاريەكانيــان، چارەســەركردنى كێشــەكان، رێكخســتنى كاتەكانى كارو ماوەى پشودان...هتد، سەرەتا خــاوەن كارگــەكان دژ بــەم داواكارييانە

و: بەرزان ئەبوبکر رەشید

# قەناعەت گەنجینەیەکی لە بن نەهاتووە!

رۆژێك لـە رۆژان لـە ناوچەیەك كە پاشـایەك لە پاشـاكان سـەرۆكایەتی ئەو ناوچەیەی دەكرد...

ئەم پادشایە كەسـێكی زۆر بەخشندە بوو بە نەرمو نیانیو دادپەروەری مامەڵەی لەگەڵ خەڵكی شـارەكەی دەكردو خەڵكی شـار زۆریان خۆش دەویسـت... سەرەڕای هەموو ئەو كارە جوانانەی هێشتا لە خۆی رازی نەبوو...

بەیانییـەك پادشـا بـە دەنگێكی زۆر خۆشو ناسكو خەم رەوێن وەخەبەر هات!

دەنگەكە پادشـای زۆر سەرسـام كرد، بۆیـە زۆر بە خێرایی بەرەو ئەو شـوێنە رۆیشـت كـە ئەو دەنگـەی لێـوە دەهات، روانـی بـۆ سـەرچاوەی دەنگەكـە، بینی ئەو خزمەتگوزارەیە كـە لە باخچەكەیدا كاردەكات، كـە لـە رووخسـاریدا جگە لە بەختەوەریو ئاسـوودەیی شتێكی دیكەی لێ بەدی نەدەكرا!

پادشـا بانگی كردو پرسـیاری لێكرد: چـۆن ئەوەندە بەختەوەریـت لە كاتێكدا تـۆ خزمەتگوزارێكی لە نێـو باخچەكەی ئێمـەداو داهاتێكـی كەمت هەیـە؟ بەڵام وادەردەكەویت كە خاوەنی هەر شتێكی كە خۆت دەتەوێتو یەكجار دڵخۆش دیاری!

خزمەتگوزارەكەش بەوپەڕی ئارامییەوە وەڵامـی دایـەوەو وتی: لەبەرئـەوەی لای پادشـا كار دەكەمو داهاتەكەشـم بەشـی پێداویستی ژیانم دەكاتو لە هەمان كاتدا شوێنی حەوانەوەم هەیە كە خانەوادەكەم بە ئاسوودەیی لە نێویدا ژیان دەگوزەرێنن! خێزانەكەشـم زۆر ئاسوودەو بەختەوەرەو رازییـە بەو ژیانەی كـە هەمانە، ئەمەش منی زیاتر دڵخۆشو ئاسوودە كردووە!

ئیـدی شـتێكی دیكە بـە لای منەوە گرنگ نییە، چونكە لەسـەر خوانەكەمان نانێك هەیە پێكـەوە لەگەڵ خانەوادەكەم بیخۆیـن، بە برسـێتی شـەوگار بەسـەر نابەین.

پادشـا بـە قەناعەتو بەختـەوەریو ئاسوودەیی ئەم خزمەتگوزارە كە گەیشتۆتە چڵەپۆپە زۆر سەرسام بوو!

پاشـان جەنابی پادشـا گەڕایەوە نێو كۆشكو بانگهێشتی وەزیرە تایبەتییەكەی خـۆی كـردو تـەواوی چیرۆكەكـەی بۆ گێڕایەوە.

وەزیر لە كاتێكدا كە زۆر بە پەرۆشەوە گوێی بۆ قسەكانی جەنابی پادشا گرتبوو، بە بیسـتنی ئەو چیرۆكـە ئەویش وەكو پادشا گەلەك سەرسام بوو.

بەڵام لە هەمان كاتدا پێشـنیاری كرد كە كارێك ئەنجام بدەن.

پادشا وتی: چۆن كارێك؟

وەزیر: بیرۆكەی ٩٩!

پاشـا بـەو وەڵامە زۆر سەرسـام بوو، بۆیە پرسی ئەوە مانای چییە؟

ئەویش وتی: ٩٩ سكەی زێڕ دەخەینە كیسـەیەكەوەو لە شەودا بێ ئەوەی كەس هەسـتمان پێ بـكات لەبـەردەرگایماڵی ئەو كرێكارە دایدەنێین، پاشـان چاودێری دەرەنجامەكەی دەكەین؟

پادشـا پێشـنیارەكەی وەزیـری لا پەسـەند بـوو، لەبەرئـەوە بڕیاریدا ئەو تاقیكردنەوەیـە ئەنجام بـدات، چاوەڕێی كرد تا شەو داهات، پاشان كیسە زێڕەكەی لە بەردەم ماڵی كرێكارە هەژارەكە داناو لە

پەنایەکدا خۆی حەشاردا تا بزانێت چی روو دەدات!

دوای ماوەیەك کرێکارە هەژارەکە بۆ داخستنی دەرگای ماڵەکەیان هاتە دەرەوە، بینی کیسەیەك لە بەردەرگا کەوتووە، کاتێك کیسەکەی کردەوەو بینی ئەو هەموو زێڕەی تێدایە لە خۆشیدا خەریکبوو باڵی دەگرت، بانگی هاوسەرو منداڵەکانی کردو پێی راگەیاندن کە کیسەیەك زێڕی لە بەردەم دەرگا دۆزیوەتەوە!

ئەم هەواڵە هەموانی یەکجار دڵخۆش کرد، دەرگاکەی داخستو چوونە ژوورەوە، شەوگار درەنگی کرد، دنیا بەرەو خامۆشی دەرۆیشتو ئەندامانی خێزانەکەی نووستن، پادشاش کە لە کلاو رۆژنەی ماڵەکەیانەوە چاودێری دەکردن، بینی وا کرێکارەکە دەستی بە ژماردنی زێڕی نێو کیسەکە کردو کاتێك زانی سکەکانی نێو کیسەکە ٩٩ دانەیە، لەبەر خۆیەوە وتی: گومانی تێدا نییە ئەم سکانە ١٠٠ دانە بوون، دیارە دانەیەکیان کەوتووە، بۆ ئەم مەبەستە هاتە دەرەوەو دەستی کردە گەڕان بە دوای ئەو تاکە زێڕەدا تا ژمارەی زێڕەکانی نێو کیسەکە ببێتە ١٠٠ دانەی تەواو!

زۆر گەڕا بە تەواوی ماندوو بوو، بەڵام بێ ئاکام بوو، پاشان بە خۆی گوت: کێشە نییە لە مەودوا زیاتر کار دەکەم تا بتوانم سکەیەکی زێڕ بکڕمو ژمارەی زێڕەکانم بگەنە ١٠٠ سکەی تەواو!

شەوگار بە تەواوی درەنگ بوو، بەو حاڵەوە گەڕایەوە ژوورەوەو نووست، بەڵام بۆ بەیانی زۆر درەنگ وەخەبەر هات، کە زانی کات درەنگەو لە کارەکەی دواکەوتووە زۆر قسەی ناخۆشی بە هاوسەرەکەی گوت، ئەو هاوسەرەی کە لەوەو پێش زۆر بەسۆزو بەزەییو میهرەبانیو نەرمونیانییەوە مامەڵەی لەگەڵ دەکرد، پاشان هاواری کرد بەسەر منداڵەکانیداو دەیگوت: بۆچی زوو بە خەبەرتان نەهێناوم، ئەو منداڵانەی کە تا دوێنێ گۆنای یەك بە یەکیانی ماچ دەکردو دەستی دەهێنا بەسەریاندا پاشان جێی دەهێشتنو دەرۆیشتە سەرکارەکەی!

کرێکارەکە سەرەڕای هەموو ئەو گۆڕانکارییە خێرایانە ماڵی جێهێشتو بەرەو کارەکەی ملی رێگەی گرت، بەڵام زۆر ماندووبوو، چونکە شەو جگە لە ماندووبوونی بۆ گەڕان بە دوای سکە زێڕەکەدا، وەکو پێویست نەخەوتبوو، هەروەها هەموو ئەو رەفتارانەی کردبووی بەرامبەر بە هاوسەرەکەیو منداڵەکانی تەواو بێتاقەت و نا ئارامی کردبوو!

کاتێك گەیشتە سەر کارەکەی، هەستی کرد کە ناتوانێت وەکو رۆژانی رابردوو کار بکات، هەروەها ئەو گۆڕانییە خۆشانەی کە رۆژانی پێشوو دەوروبەری سەرسام دەکرد، ئەمرۆ نەك نەمابوو، بەڵکو خەمو پەژارەو بێتاقەتی و شەکەتی جێگەی گرتبۆوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە نیاز بوو لە رۆژانی پێشوو زیاتر کار بکات، تا داهاتی زیاتر دەستبخات بۆ کڕینی سکە زێڕەکە!

پادشا کە بە درێژایی ئەو شەوە ئاگاداری تەواوی سیناریۆکە بوو، زۆر سەرسام بوو!

وەزیرەکەی بانگکردو تەواوی رووداوەکانی شەوی رابردووی بۆ گێڕایەوە، لەگەڵ ئەو هەموو گۆڕانکارییە خێرایانە پادشا هێشتا وا گومانی برد کە کە ئەو کرێکارە دەتوانێت بەختەوەرییەکەی جارانی بە دەست بهێنێتەوە، ئەگەر ببێتە خاوەنی ئەو پارچە زێڕەو سکەکانی بگەنە ١٠٠ سکە!

ئەو کات بە دڵنیاییەوە ئەم کرێکارە دەتوانێت هەرچی خانەوادەکەی حەزی لێ بکاتو پێیان خۆش بێت بۆیان دەستەبەر بکات، بەڵام بە داخەوە ئەوە رووی نەدا!

وەزیر زۆر بە باشی گوێی بۆ قسەی جەنابی پادشا گرتبوو، پاشان پێی گوت: جەنابی پادشا ئەم کرێکارە ئەو بارودۆخە پڕ ئارامیو هێمنییەی کە تێیدا بوو هۆکارەکەی ئەوەبوو کە قەناعەتیان بەو داهاتە کەمە هەبوو کە خاوەنی بوون، ئەوان بەختیار بوون، چونکە شتێك نەبوو لە ژیاندا سەرقاڵیان بکات، ئەوان بەرهەمی ئەو قەناعەتەیان دەخوارد کە هەیان بوو، بەڵام ئەمرۆ کە لە ناکاو بە بێ ماندوو بوون بۆتە خاوەنی ٩٩ سکەی زێڕین هەر بۆیە قەناعەتیان پێی نییەو داوای زیاتر دەکەن!

ئایا دەزانیت کاتێك مرۆڤ لە ناکاو سەروەتێکی زۆری دەست دەکەوێت بەبێ ماندووبوون، قەناعەتی پێ ناکاتو بەردەوام بە دوای زیاتردا دەگەڕێت، تەنانەت ئەگەر بەشی هەموو پێداویستیەکانیشی بکات؟!

پادشا قەناعەتی بە وتەی وەزیرە ژیرو لێهاتووەکەی کردو بڕیاریدا لەمرۆ بەدواوە کە قەدرو رێزی هەموو ئەو شتانە بگرێت کە خاوەنیەتی تەنانەت شتە بچووکەکانیش، سوپاسی خوداش بکات لەسەر هەموو ئەو بەهرانەی کە پێی بەخشیوە، زۆر راستە کە وتراوە قەناعەت ئەو گەنجینەیەیە کە هەرگیز لە بن نایەت!

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت هۆکاری بەختەوەری مرۆڤ قەناعەتە نەك سەروەتو سامان!

سەرچاوە: سایتی (المسلم).

١- ژیان فێری کردم کە دووجۆر مرۆڤ هەیە:

یەکەمیان: ئەو کەسەیە کە هەوڵ دەداتو ماندوو دەبێو بەرهەم دەهێنێ، هەروەها هەوڵ دەدات بۆ هێنانە دی خواستو ئاواتەکانی، هەمیشە دەیەوێت خۆیو دەوروبەر ئاسوودە بکات، ئەمەش کارێکی ئاسان نییە، هەر بۆیە کەمێك لە خەڵکی لەم جۆرەن.

دووەمیان: مرۆڤێکی بەخیلو حەسوودە، ئیرەی بە جۆری یەکەم دەباتو هەمیشە وا دەزانێت قسەی باقو بریقەدار چارەسەرە، رەخنە دەگرێ لەو کەسەی سەر دەکەوێت... هتد، ئەمەش ئاسانە بە هەموو کەس دەکرێت!

٢- ژیان فێری کردم کە هیواکان بە دەست نایەن بەبێ دەردەسەری!

٣- ژیان فێری کردم کە لە کۆتاییدا هەر ئەو کەسە سەردەکەوێت کە توانای خۆڕاگریو ئارامگرتنی هەیە!

٤- ژیان فێری کردم کە شکستخواردووەکان دوو بەشن: بەشێکیان بیر دەکەنەوەو جێبەجێی ناکەن، بەشەکەی تریان جێبەجێی دەکەنو بیر ناکەنەوە!

٥- ژیان فێری کردم کە پێویستە دەوڵەمەندەکان بزانن هەژارەکان چۆن ژیان دەگوزەرێننو تووشی دەردەسەریو مەینەتی دەبن، لە هەمان کاتدا پێویستە هەژارەکانیش فێر بن کە دەوڵەمەندەکان چۆن کار دەکەنو بیر دەکەنەوە، تا لەوانەوە فێر بن!

سەرچاوە: أفكار من ذهب.

# ئاسۆی وێنەیەك

سەرنجی ئەم وێنەیە بدەو بە دیدو خەیاڵی تیژو
هەستی ناسکت بۆی بنوارەو پاشان خامەکەت
هەڵبگرەو گوزارش لەو هەستە ناسکو خەیاڵە
وردو سۆزە بێ سنوورەت بکە،
تا ببیتە خاوەنی یەکێک لەم دوو خەڵاتەی خوارەوە:
- بەشداری بێ بەرامبەری ساڵێکی گۆڤاری بڕیار.
- بەشداری بێ بەرامبەری شەش مانگی گۆڤاری بڕیار.

دوا مۆڵەتیش بۆ وەرگرتنی وەڵامەکان
(١٠) ڕۆژ دوای دەرچوونی گۆڤارەکەیە.

خەڵاتی یەکەم
زرنگ واژەیی

تۆ بنوارە
لە ئەم دڵە بریندارە
لەم دڵە پڕ لە زامو پڕ ئازارە
لەم دڵە بێجێو لانەو بێ دەوارە
ئەو دڵەی کە
پڕ ئازاری بێ شومارو
پەنجەگەزی پەشیمانیو بەدکردارە
لە ئەو دوورە
بۆیە ئاوا پڕ بیمارو بێ تیمارە
لە ئەو یاخیم
بۆیە دنیاش لای چاوی دڵ
وەك چوارچێوەی رەشو تارە
بەڵام هەرچەند
دڵ بەو جۆرە گوناهبارە
ئەو بە میهر و جوان کردارە
بۆیە لەودیو دڵی رەشم
رووناکییەکی سپی دیارە
ئەویش نوری دەرگایەکە
کەوالایە بۆ ئەو کەسەی تۆبەکارە

# ڕاهێنانی مێشك

به وردی لەم وێنەیە ورد بەرەوەو

هێزی مێشکو بیرکردنەوەت بخەرەکار،

بزانه چی دەبینیت؟

تا چ رادەیەک دیدی تێڕوانینت وردە؟

سوپاس بۆ ئەو بەڕێزانەی کە لە خوارەوە ناویان هاتووە.
بە شیعر یاخود پەخشان بابەتیان ناردووە بۆ ئاسۆی ژمارە (٢٢)

١- راستی فەهمی
٢- رزگار غەریب
٣- نور ئەبوبەکر عەلی
٤- تابان فەهمی
٥- بڕیار سالار
٦- هیشام عەبدول عەزیز
٧- بەهەشت عەلی
٨- هێرش خدر
٩- فریشتە فەرەج
١٠- شارا حەمە عەلی
١١- سروە قەڵادزەیی
١٢- موختار حەمە نوری
١٣- ئیبراهیم باوایی

## خەڵاتی دووەم

جلال عبدالله حاجی

ئەی خودا...
ئەوەی هەمە، تەنها دڵێك
رەش بوو بە دووکەڵی تاوان
جێگای برینی زمانو...
جێگای شکاوی بەڵێنو...
کون کونە بە نیگای چاوان
مەگەر تەنها لوتفی تۆبێ
تاوانی من بسڕێتەوە.
دەستم بگریت..
سنگم شەق کەیت..
پەڕەی ژینم پاك کەیتەوە..
تۆ تەمەنێك عومرت داپێم
من نەم توانی بژیم بۆ تۆ
دڵ شکاوو بریندارم
لە رابردووم
پەشیمانم...
بە ئومێدم بە رەحمی تۆ..
بە لوتفی تۆ..
خودای گەورەو میهرەبانم
بێ سۆزو میهرەبانی تۆ
وێڵ و کەساسو
سەرگەردان
غەرقی گوناهو تاوانم.

# پاراستنی نهێنییەکانی خێزان ئەرکی هەردوولایە!

پەری شێخ کەریم

بێگومان هاوسەران بەهۆی ئەو پەیوەندیو ژیانە هاوبەشەی کەپێکەوە بەسەری دەبەن، زۆرێك لە نهێنیو تایبەتمەندیی یەکتریان دەکەوێتە لا، پێویستەلەسەر هەردوولا پارێزگاری لە نهێنییەکانی یەکتری بکەن تا بەردەوام متمانە بە یەکتری بکەن، چونکە بە لە ناوچوونی متمانە ئەو خێزانە بەرەو تیاچوون دەچێت٠

کارێکی زۆر نەشیاوە ئەگەر پیاو نهێنی خێزانەکەی باس بکات یا بە پێچەوانەوە ئافرەت باسی نهێنی هاوسەرەکەی بکات٠

نهێنییەکانی خێزانیش دەکرێت بەدووجۆرەوە: جۆرێکیان ئەوەیە دەرخستنی نهێنییەکی چاکە چ کردار بێت یاخود گوفتار لە لای کەسێك کە جێی متمانە نەبێت لەوانەیە بەو باسکردنە تووشی ئیرەیی بێت، (هەروەك لە داستانی پێغەمبەر یەعقوبدا (درودی خودای لێبێت) هاتووە کە ئامۆژگاری یوسفی کرد کە خەونەکەی نەگێڕێتەوە بۆ براکانی)٠

ئەم داستانە کە لە قورئاندا باس کراوە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی زۆر جار باسکردنی کارێکی باش لە لای کەسانێك کە جێی متمانە نین دەبێتە مایەی کێشەو گرفت٠

جۆری دووەم: بریتیە لە دەرخستنی نهێنی خراپ، چ لە نێوان هەر یەك لە تاکەکانی کۆمەڵ بێت یاخود نێوان لە هاوسەراندا ئەنجامێکی خراپی دەبێت، بۆ نموونە زۆرێك لە پیاوان سەرزەنشتی خێزانەکانیان دەکەنو دەڵێن: خێزانەکانمان نهێنی ناپارێزن هەر کێشەو ناخۆشییەك لە نێو ماڵەکەماندا دروست ببێت لە لای دایكوخوشكو هاوڕێکانیان باسی دەکەن، بۆ نموونە زۆر جار کە دەگەڕێنەوە بۆ ماڵەوە بە مۆبایل لەگەڵ کەسێکدا قسە دەکات، دەنگی هێواش دەکاتەوە یا پچرپچری لە قسەکانیاندا دەبینرێت، ئایا لە خوا ناترسێت شەرم لە هاوسەرەکەی ناکات ئەمەش بێگومان بێوەفاییو خراپ مامەڵەکردن دەنوێنێت) ئەگەر بە مەبەستی چارەسەرکردن باسی بکات ئەوە کێشەکەی ئاڵۆزتر کردووە، بێگومان ئەو ئافرەتە هیچ نرخو بایەخێك ناهێڵێت بۆ هاوسەرەکەی لەلای ئەو کەسانە٠

هەر وەك چۆن باسی نهێنی هاوسەرانمان کرد لەلایەن ئافرەتانەوە، هەندێجار هاوسەران نهێنی خێزانەکانیان دەردەخەن، ئافرەتێك دەڵێت: (زۆر بەداخەوە! کاتێك دانیشتنێکمان دەبێت لەگەڵ کەسی خۆمدا بێت یا کەسی هاوسەرەکەم یا میوانێکمان هەبێت، لە لای میوانەکان سەرزەنشتم دەکاتو کەمتەرخەمییەکانم باس دەکات بە شێوازێکی گاڵتەپێکردن، بەڕاستی ئەم کارەی زۆردلگرانم دەکات، لەلای ئەو کەسانە بێنرخو بێڕێز سەیرم دەکات)٠

هۆکارەکانی دەرخستنی نهێنیش دەگەڕێتەوە بۆ ئەم هۆکارانە:

ئارام نەگرتن لەسەر ئەو شتانەی کە ڕووبەڕووی هەر دوولا دەبێتەوە چ کێشە بێ یا کەمتەرخەمی ناتوانن ئارام بگرن لەلای کەسانی تر باسی دەکەن، هەر وەك زۆر کەس دەڵێت باداخی دڵم دەرچێت! ڕەنگە زۆر جار لە دڵی خۆیدا بیهێڵێتەوە باشترە، لەوانەیە پاش ماوەیەك ئەو خەمەی بڕەوێتەوە نەك بیخاتە دڵی کەسانی ترەوە٠

هەر وەك زانایان دەڵێن: (ئەو کەسەی نهێنی دەردەخات سنگی فراوانو ئارامگرنییە)٠

بێگومان کەسی عاقڵ کاتێك قسە دەکات دەزانێت چی دەڵێت؟ بەواتایەکی تر عەقڵی ڕێگای دەدات بە کردنی قسەیەك کەقازانجی هەیەو بە شاردنەوەی قسەیەك زیانی هەیە بۆخۆیو دەوروبەری٠

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر بێت) دەفەرموویت: (هەر کەسێك نهێنی موسوڵمانێك بپارێزێت خوای گەورە لە دنیاو قیامەتدا دەیپارێزێت)٠ کەواتە هاوسەرانی بەڕێز ئارامگرتنتو شاردنەوەی نهێنییەکانی ماڵەکەت ڕەوشتێکی جوانتان پێدەبەخشێت، بەڵام بە پێچەوانەوە بە ئەقڵی خۆتان ئاگر دەخەنە نێو ماڵەکەتان

دوژمنایەتی بۆ یەکتری دروست دەکەنو متمانە بوونتان لە دەست دەدەن.

(جارێکیان شەڕو ناکۆکی لە نێو دووهاوسەردا دروست دەبێت، ئافرەتەکە زۆر دلگران دەبێتو دەگری لەو کاتەدا ماڵی باوکی لە زەنگ دەدەن، هاتوون بۆ سەردانی کچەکەیان کاتێك دەبینن سیمای دڵتەنگی پێوە دیارە لێی دەپرسن ئەوە بۆ دەگری؟ ئافرەتەکە دەڵێت: دانیشتبووم زۆر یادی ئێوەم دەکرد، ئاواتە خواز بوو کە بتانبینم، سوپاس بۆ خوا ئاوا بە یەکتری شاد کردین، هاوسەرەکەی گوێی لە قسەکانی بوو کە چۆن خێزانەکەی بارودۆخەکەی گۆڕی لەبەر دروست نەکردنی ناکۆکی لە نێوان کەسوکاریو هاوسەرەکەیدا، هاوسەرەکە ڕێزو خۆشەویستی خێزانەکەی لە لا زیاتر بوو، دیارییەکی زۆر بە نرخی بۆ کڕی هەتا بتوانێت پاداشتی ئەو کارەی خێزانەکەی بداتەوە).

هۆکارێکی تری درکاندنی نهێنی ئەوەیە (غرور) شانازیو خۆ بەزل زانینە، ئەم جۆرە کەسانە کاتێك تووشی هەر حاڵەتێك بێت باسی دەکات ئەگەر کارەکە خۆش بێت بە شێوەیەکی خۆبەزلزانینەوە باسی دەکات، ئەگەر ناخۆش بێت بەشێوەیەك باسی کێشەکە دەکات ئازایەتیو زاڵبوونی خۆی دەردەخات بەسەر ئەوی تردا.

هۆکارێکی تر ئەوەیە ڕازی نەبوون بەو شتانەی کەخاوەنییەتی. بەداخەوە ئەم هۆکارە زیاتر لە ئافرەتاندا هەیە کاتێك بارودۆخی مادی هاوسەرەکەی باش نییە، باسی هەژاریو کەم دەستی خۆیان دەکات لە لای هاوڕێو کەسوکاری، بەڕاستی ئەمەش کارێکی ناشیرینە هاوسەر زۆر ناڕەحەت دەکات، بەڵکو دەتوانێت بەشێوەیەك خۆی دەربخات کە هیچ کەسێك بە بوونو نەبوونی نەزانێت، بەڵام بە پێچەوانەوە زۆرێك لە ئافرەتان کاتێك بارودۆخی مادیان باشە لە لای هاوڕێو کەسو کارەکەی باسی جۆری خواردنو یاخود شتی گرانبەها دەکات، یاخود چوونیان بۆ فلان شوێنی بە ناوبانگ، ئەمەش سیفەتێکی ناشیرینەو لە قسەکاندا دەردەکەوێت شانازیت بەسەر کەسی بەرامبەرتەوە کردووە، لەوانەیە ئەو کەسە کاتێك ئەو شتانە دەبیستێت بڕەنجێت یاخود خۆت تووشی ئیرەیی بکەیت.

لە کۆتاییدا داواکارم لە پەروەدگار هەموو لایەك سەربەرزو سەرکەوتوو بکاتو دوور بین لە هەموو کێشەو ناخۆشییەك.

ئازاد محێدین

# گفتوگۆیەکی کورت لە نێوان ژیانو مەرگدا

## ژیان

پڕ کارەسات و پڕ دەردو غەمم
پڕ جەورو جەفاو، زوڵمو ستەمم
لەگەڵ بوونمدا، مەرگ بوونی بوو
پێوانەی دووری، نێوانمان نەبوو!
لەمەرگا پڕم، پڕم لە مەرگا
هەرکاتێ ویستی، لێم ئەگرێ دەرگا!
هیچ دەرگاوانێ، ڕێگریت ناکا
لە باڵەخانە، یان لە ژێر خاکا
تەقەت لەدەرگا، هەرگیز نەداوە
سەعاتی سفرت، بۆ دانراوە!
بەجێ ناهێنی، هەرگیز خواستم
بەزەییت نەبوو، ساتێ لە ئاستم؟
زۆر جار بێ مانا، بۆم هێنای هانا
پێشو پاش ناکەی، قەت لە فەرمانا!
نازانم من تۆم، یاخۆ تۆ منی؟
ئەتۆ دۆستمی، یاخۆ دوژمنی؟
بەرگریم نییە، بێ دەسەڵاتم
لەئاستی تۆدا، لەوێش کە هاتم!
وامن حاڵی خۆم، بۆ کردی بەیان
کورتەی پێناسەت، ئەخوازێ ژیان.

## مەرگ

من مژدە دەرم، بەرەو ڕزگاری
کۆتایی دێنم، بە ستەمکاری
من فریاد ڕەسم، گشت کاتو ساتێ
بۆیە تامەزرۆم، دەستم بتگاتێ
ئەمن، لێواو لێو، پڕ لە ژیانم
سەرەتای ژیانێکی، سا بێ پایانم
هێندە دڵسۆزم ،من لە ئاستی تۆ
پاساپۆرتێکی، وام خرایە ئەستۆ
بۆ ئەوەی واتای، ژیان لە دەست نەدەی
دیاری نەکراوە، چۆنو لە کوێو کەی
گەر هاتوو خواستت، پەشیمانی بوو
ناگەڕێتەوە، هەلی لە دەستچوو
بەڵێنێکی ڕاست، خوا بە تۆی داوە
کەی پێشو پاشی، وا بە دواوە
نموونەیەکی، بچوکی لە من
هەرگیز خۆم بۆ خۆم، نابم بە دوژمن
بەرگریت لە کێو لەسەر چیو لە کوێ
تەریبم لەگەڵ، ڕەگی بناو گوێ
ژیان پێناسەی، کورتم وەهایە
چاکم بناسە، زۆر پڕ بەهایە.

بۆ ئەوەی ژیانی هاوسەرێتی بە باشی پێش بکەوێت ئەوە لە خۆڕا چاوەڕێی ڕووداوی موعجیزە ئاسا مەبە.

لە بەرامبەردا دەتوانیت خۆت بە دوور بگریت لەو داوو تەڵانەی کە ڕەنگە لە ماوەیەکی دوورودرێژدا پەیوەندییەکانت سستو لاواز بکەن. لەم بابەتەدا چەند ڕێنماییەکی بچوك دەخرێتە بەردەست سەبارەت بەو نەریتو خووە خراپانەی کە دەبێت بە تەواوی بخرێنە لاوەو فەرامۆش بکرێن.

١- تەلەفزیۆن: تەلەفزیۆن عیشق کوژە. هیچ گومانێکت لەوە نەبێت، ڕێ لە خواردنی ئێوارانی بەردەم تەلەفزیۆن بگرە، چونکە هەموو ژەمە ئێوارەکانی بەردەم تەلەفزیۆن بێژەرەکان لێناگەڕێن کە ئێوە هەستتان پێکەوە گرێ بدەن، ئاگاتان لە یەکدی بێت، بەدەر لەمەش هێندە لەبەردەم تەلەفزیۆندا سەیری فیلمت کردووە کاتێك کە دەچیتە سەرجێگە ئیدی کاتێکت نییە بۆ قسەو گفتوگۆکردنو لە یەکدی بەخەبەر بوون، تەنها چارەی ئەم مەسەلەیە ئەمەیە کە ئەم دوژمنە لە ژیانتان بکەیتە دەرەوە! بۆ ئەوەی کە لەم کارەدا توندگیر نەبیت دەتوانیت بەمە ڕازی بیت کە لە هەفتەدا چەند شەوێك تەلەفزیۆنەکە بکوژێنیتەوە.

٢- سەردانو میوان نشینی: بە هۆی تەلەفزیۆنەوە یا هەر بیانویەکی دیکەوە، نارۆیتە دەرەوە! بۆ مەگەر دەرگای ئەو چایخانەو ڕێستورانتە بچکۆلەیەی کە هێندە عاشقو شەیدای بوویت، چی لێ بەسەرهاتووە؟ ئەی ئەو شەوانەی کە دەرۆشتنە سینەماو سەرقاڵی بڵێو مەڵێی گەرموگوڕو پڕ لە شۆرو شەوق بوون چییان لێ بەسەرهات؟ ئێستا تەنها مانگی شەوێكو ئەویش بۆ دیداری هاوڕێو دۆستان دەرۆیتە دەرەوەو بەدڵنیاییەوە ئەوانیش هەربۆ دیدەنی تۆ دێن. ئیدی باسێك لە گەشتی دووقۆڵیو شەونشینی ڕۆمانسییانە نییە! دەبێت دووبارە ئەو کەشو هەوایە وەدەست بێنیتەوەو بە ڕێکەوتنو ڕەزامەندی هەردووکتان بڕۆنە دەرەوە! ئێستا کە بەو زووانە لە شەڕی تەلەفزیۆن ڕزگارت بووە، بۆ گەشتو گەڕانو پیاسەو چوونەدەرەوەی دووقۆڵی سوود لەو پارەیە وەربگرە کە پاشەکەوتت کردووە.

٣- کاری زۆرو زیادە کاری: چیدی درەنگ لەسەر کار مەگەڕێرەوە! نەك تەنها بۆخۆتان کاتتان نییە، بگرە تورەییو ماندوێتیش لەگەڵ خۆتدا دێنیتەوە بۆ ماڵەوە، کە ڕاستییەکەی بەدەر لە ناخۆشی شتێکی دیکەی تێدا نییە بۆ هاوسەرەکەت. تەنها ئەمە بەسە کە کارکردن هەموو کاتەکانی ژیانتان بەخۆیەوە سەرقاڵ بکات ئیدی بەخێرایی دەبێتە تەنها بابەتی ماڵەوە بۆ قسەو باس لەسەر کردن. ئیدی بەسە! هەوڵبدە بە ئەندازەی پێویست زوو بگەڕێیتەوە بۆ ماڵەوە تاوەکو بەر لە نانی ئێوارە کەمێك کاتتان هەبێت بۆ پێکەوە بوون لەگەڵ ماڵەوەدا، بە مەرجێك لەم ماوەیەدا لە بەردەم تەلەفزیۆندا دانەنیشیتو ئەوەندەی تر مێشکت جەنجاڵ بێت! بە تایبەت بۆئەوەی کە گرنگییەکی زیاتر بە یەکدی بدەنو لە یەکدی ئاگادار بن، کار لە بیر بکە.

٤- گرنگیدان بە سیماوروخسار: بیر لەوە مەکەرەوە هەر لەبەرئەوەی کە چوویتە نێو پرۆسەی هاوسەرگیرییەوەو چەند ساڵێکیش بەسەر ژیانی هاوسەرێتیتاندا تێپەڕیوە، ئیدی گرنگی بە سەروسیماو ڕوخسارتان نەدەن! دەسبەرداری شپرزەییو ئاڵۆز بووون بە، قژت بە پەرژو بڵاوی و شپرزەیی مەهێڵەرەوە، لە پەرژو بڵاوکردنەوەی شتومەك لە ماڵەوە خۆت بە دوور بگرە، ئاوڕێك لە خۆتان بدەرەوە! بە دڵنیاییەوە هاوسەرەکەتان هەر بەو شێوەی کە هەیت تۆی خۆش دەوێت! ئیدی بۆچی هەوڵنادەیت خۆت بە باشترین شێوە دەربخەیت؟ بەم شێوەیە ئەوە نیشان دەدەیت کە ئامادەیی هاوسەرەکەتو ئەو کاریگەرییەی کە ئەو لەسەر تۆ بەجێدێڵێت لات گرنگ و بەهادارە.

٥- گرنگی پێنەدان: یەکێکی دیکە لە دوژمنە گەورەکانی هاوسەرێتی بریتییە لە گرنگی پێنەدان، مەبەست لە گرنگی پێنەدان لێرەدا کڕینی گوڵ یاخود دیاری نییە، بەڵکو تەنها سەیرکردنی هاوسەرەکەتانە. کاتێك کە هاوسەرەکەتان چووە بۆ ئارایشگا یاخود چاکەتێکی نوێی کڕیووە، ئەوە سەرنجو گرنگی پێدانی خۆتی بۆ دەربڕە، بە تایبەت کاتێك کە جوانو شیك دەیبینیت یا ئەو کاتەی کە ئەو بە وەسفو ستایشی جوان تۆ دەخاتە ژێر کاریگەرییەوە ئەوا تۆش ستایشی بکە، چونکە ستایشو وەسفکردن هەمیشە

خۆشی بەخشن، بەڵام کاتێک کە بە دروستیو گونجاوی بەکار بهێنرێن.

٦- ئیرەییو حەسودی بێ ئەندازە: دەست لە خستنە ژێرباری پرسیارو وەڵامو بە دواداچوونی هاوسەرەکەت هەڵبگرە، چونکە ژیانی هاوسەرێتی لەسەر بناغەی متمانەیی دوو لایەنە دادەمەزرێت، گومانو بەدگومانی لە رادەبەدەری تۆ، دواجار ئەو ناچار دەکات بە ستایشی کەسێکی دیکە.

٧- خێزانی هاوسەرەکەت: نەخێر، بەدڵنیاییەوە خێزانی هاوسەرەکان هەمیشە هەر بەو شێوەیە نین کە لە فیلمەکاندا نیشان دەدرێن، لێکگەیشتنی نێوان هاوسەرەکەتو خێزانەکەت بە زۆریی دەتوانێت گەرمو دۆستانە بێت، بەڵام خاڵی گرنگ ئەمەیە بزانیت کاتێک کە ئەم لێکگەیشتنە بە ئەندازەی پێویست هەیە، هیچ شتێک بەسەر خێزانەکەتدا نەسەپێنیت. هەر کاتێک هەستت بەوەکرد کە هاوسەرەکەت خەریکە لە هاتوچوونی کۆتایی هەفتەکان ماندوو دەبێت ئەوە پێداگری لە هاوسەرەکەت مەکە بۆ ئەوەی کۆتایی هەفتە لەگەڵ ماڵە باوانی تۆدا بۆ خواردنی ژەمی نیوەڕۆ ئامادە بێت، هەڵبەتە ئەمە سەبارەت بە هاوکارانو دۆستە کۆنەکانیشت هەر راستە.

٨- نەبوونی بەرنامە:

پێکهێنانی خێزان بە مانای بەسەربردنی ژیان بەبێ لەبەرچاوگرتنی ئاییندە نایەت، ئێوە دەبێت بە رێکەوتن ئایندەش بسازێنن، لەو بەرنامە ماوە کورتانەوە (ئەو شوێنەی کە کاتی پشووی تێدا بەسەر دەبەیت، کڕینی ئۆتۆمبیلو...) بگرە تا بەرنامە گەورەکانی (بوونە خاوەن منداڵ، رۆیشتنە سەفەرو...) دەستبەجێ بیر لە ئایندەتانو ئەمە بکەرەوە کە چۆن رووبەرووی دەبیتەوە، ئەم کارە پەیوەندییەکانت سازگارترو گەرموگوڕی پێشکەوتن لە ژیانی تۆدا دەگەشێنێتەوە.

٩- بێدەنگی: بەدڵنیاییەوە نەبوونی گفتوگۆ زیان بە ژیانی هاوسەرێتی دەگەیەنێت، پاڵپشت بە هۆکاری جۆراوجۆر ئەم مەسەلەیە لە کەمی کات یا گرنگی پێنەدانی ژنومێرد بە یەکدییەوە سەرچاوە دەگرێت، لەگەڵ ئەمەشدا بە شێوەیەکی ئاسایی گفتوگۆ لە نێوان ژنو مێرددا دروست دەبێت، بەڵام هیچ کام لە لایەنەکان گوێ بۆ قسەکانی ئەوی دیکە ناگرێت. لەم حاڵەتەدا پێکەوە مەسەلەیەک بخەنە روو، هەوڵبدە لایەنی بەرامبەرت دەرک بکەیت. لە کاتی پێویستیشدا یارمەتی لە دەروونناسێک وەربگرە.

# چاوەکانم دەبینێت

قاسم سروش

لەم پەندەوە فێردەبین کەوا زانستو زانیاری موڵکی کەس نییە، لەبەرئەوەی زانیاری بۆ هەموو کەسەو پێویستە ئەوەی زانستی هەیە بیگەیەنێت، گەنجێک لە یەکێک لە ناوچەکانی ئەم جیهانە بەرینەدا ژیانی دەگوزەراند، ئەو گەنجە خاوەن چاوێکی زۆر جوانو سەرنج ڕاکێش بوو، لەگەڵ ئەوەش خاوەن ژیرییەکی بێ ئەندازە بوو لە خوێندنو هەمیشە ئاواتی ئەوە بوو ببێتە کەسێکی بە سوود بۆ مرۆڤایەتی، لە قۆناغەکانی خوێندنی هەمیشە پلەی نایابی وەردەگرت، تەنها گرفتو کێشەی ئەو گەنجە ژیرو خاوەن بەهرەیە ئەوە بوو کە هەمیشە بە جوانی چاوەکانی خۆی لە پێش چاوی هەڤاڵەکانی نازی دەکرد، زۆر جار لەبەر چاوەکانی هەڤاڵەکانی دەتۆراندو گاڵتەی پێ دەکردن، رۆژێک ئەو گەنجە لە کاتی گەڕانەوەی بۆ ماڵ ژیانی بە تەواوی گۆڕانی بەسەردا هاتو بڕیاریدا چیتر بە چاوە جوانەکانی ناز نەکاتو لەخۆی بایی نەبێ و هتد... سوپاس گوزار بێت، ئەوەش لەوەوە دێت کاتێک لە قوتابخانە دەگەڕایەوە لە ناو شەقامەکە پیرەمێردێکی ریشسپی بینی کە خەریکە سەیارە لێی دەدات، بۆیە بە پەلە خۆی گەیاندە پیرەپیاوەکەو لە شەقامەکە پەڕاندییەوە، رزگاری کرد لە کارەسات، پێش ئەوەی ئەو کوڕە لاوە ئەو پیرە بە ئەزموونە بە جێ بهێڵێت، پیرە پیاوەکە وتی: کوڕی خۆم لە جیاتی ئەوەی رزگارت کردمو یارمەتیت دام منیش بە پێویستی دەزانم شتێکت فێر بکەم کە لە ئەزموونی ژیانم فێری بووم، زۆر سوودم لێیەوە وەرگرت، پیرەکە وتی: ئەو قسەیە لە مێشکت بگرەو بیری لێ بکەوە، ئەو گەنجەش خێرا دەفتەرێکی دەرهێنا، تا ئەو ئەزموونە فێربێتو بینووسێتەوە، ئەزموونەکەش ئەوە بوو: (بیر لە چاوت بکەوە پێش ئەوەی کوێربیتو خەڵک ببنە بیرەر لە چاوەکانت، سەیری چاوی ئەوانە بکە کە نابینانو نابینن، پێش ئەوەی بە کوێری چاوەکانت کوێرەکان نەبینێت)، پیرە پیاو کوڕە گەنجەکە لێک جوودا بوونەوە، ئەو گەنجە ئەو قسەی پیرە پیاو زۆر کاری لێکردو کاتێک بیری لێ دەکردەوە فرمێسک لە چاوەکانی دەهاتە خوارەوە بەوەی چۆن بیری لە چاوەکانی نەکردۆتەوە، هەمیشە نازی بە چاوە جوانەکانی کردووەو سوپاسی خوای کرد لەوەی کە چاوەکانی دەبیننو رۆشناییان تێدایە)..

کەواتە با هەمیشە لە یادمان بێت زیرەکی بێ بیرکردنەوە لە ژیان مرۆڤ تووشی شۆک دەکات، هەروەها پێویستە بەردەوام سوپاسی خوا بکەین لەسەر جوانی چاوەکانمان نەک بنازین پێیانەوە.

# منداڵو گریان

ئامادەکردنی: کامەران محەممەد ئەمین ئیسماعیل – ڕانیە

گریان شتێکی سروشتییە هەر لە منداڵێکی شیرەخۆرەوە تا دواین قۆناغی پیربوون لەگەڵ مرۆڤدا ئاوێتە دەبێت، تێکەڵی ژیانی مرۆڤەکان دەبێ بە خۆشیو ناخۆشییەکانەوە، کەواتە گریان سیفەتێکە لە سیفەتەکانی هەڵچوونی دەروونی دەکرێ گریان بە یەکێك لە هۆکارەکانی گەیاندن پێناسە بکەین، کە منداڵان وەك فشارو بیانوو پێویستەکان بەکاری دەهێنن لەگەڵ کەسی دەوروبەریاندا بۆ بەدەستهێنانی حەزو خواستو مەرامەکانیان، دەشکرێ گریان گەلێ جار بۆ دابینکردنی پێداوستیو چاکردنی هەڵوێستی بەرامبەر بێت، هەندێجار گریانەکان ڕاستەقینەنو هەندێجار دروستکراون، شالاوی گریان سەرتاپای تەمەنەکانی مرۆڤی گرتۆتەوە، بەڵام گریانی منداڵێك لە چاو ژنێکداو گریانی ژنێك لەچاو پیاوێکدا جیاوازەو بە پێی شوێنو کاریگەری گریانەکەو بە دواداچونی جیاوازی دەبێت لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر...

دەگوترێ گریان تاکە ڕێگایەکە منداڵ دەتوانێت لەو سۆنگەیەوە چی لە دڵو دەرووندایە دەری ببڕێو گەلێ جار بە دەستی بێنێ، تورەبوونو سزادان بەرامبەر بە منداڵ نەك هەر تەنها نابێتە کۆتایی هاتن بە گریانەکە، بەڵکو نابێتە ڕێگا چارە بۆ پەروەردەکردنو فێرکردنیشو ئەو کاتو ساتانەی منداڵ لە ژێر فشارێکی توند بەرامبەر خێزان دەبێتەوەو لە بەرامبەردا بێشك دووچاری زۆرێك لە دەستدانی هۆکاری دەروونیو جەستەیی دەبێت، بە هۆی دەرئەنجامی ئەوهەموو شالاوی قووتدانەوەی ئەم هەموو پیشخواردنەوەی کۆئەندامی هەناسەدا کاریگەر دەبێ، ئەو کات ئۆکسجین وەرگرتن لە هەواداو لە هەناسە وەرگرتنو هەناسەدانەوەدا بە ڕێژەیەکی کەم دەچێتە سییەکانەوە ئەو کات هەناسەدان پچرپچڕ دەبێت، ئەمەش بە گوتەی پێشبینی زۆرێك لە لێکۆڵینەوەی پزیشکانی دەروونی منداڵ پێش بە چالاکیو وزە دەگرێو کاردانەوە لەسەر سییەکانی منداڵ دروست دەکات، لە داهاتوودا هەر لە منداڵێکەوە تا قۆناغی کامڵ بوون ڕەنگدانەوەی دەبێت، مافەکانی لێ زەوت دەکرێ بەوەی کە وەکوو پێویست ناتوانێ گریانەکەی بە تەواوی دەر ببڕێو کوڵی خەمەکانی ناخی بە گریانو چەند هەنسکێك هەڵبڕێژێ، ئەو کات کاردانەوەیەکی نا تەندروست جێدەهێڵرێو پاشماوەی ئەم کپکردنە کار دەکاتە سەر کرداری هەناسەدانو وزەو توانا، ڕاستە گوێبیستی گریانی منداڵ ئاوازێکی بێزارکەرەو خۆش نییە، بەڵام بیرمان نەچێ لای منداڵ ئەم دەربڕینە جیاوازترە، گریانی منداڵ کەشێکی هێمنو ئارام لە ناخو پاشماوەی گریانەکەدا بەجێدەهێڵێت زۆرجار سەر کوتکردنی گریانو پەنا بردن بە لێدان پاشماوەی خراپ جێ دەهێڵێت.

### * ئایا گریان جۆری هەیە؟

- دەڵێین بەڵێ گریان چەند جۆرێکی هەیە (نوکە نوك)، (گریانی ماوە کورت)، گریانی ماوە درێژ)، (تێکنانی دەم و چاو)، (گۆڕانی ڕەنگی دەم و چاو لە ڕەنگی ئاسایی و بۆ ڕەنگی سوور هەڵگەڕان)، (هاوارکردن)، (قیژاندن)، (گریان بەبێ دەنگ لە دڵدا)، (گریان بە دەنگی نزم)، (گریان بە دەنگی بەرز).

### * منداڵ چ کاتێك دەگری؟

١- ئەو کاتەی منداڵێکی هاوتەمەنی شالاوی بۆدێنیو ئازاری دەداتو کەلو پەلەکانی لێ دەستێنێ ئەم بێدەسەڵاتەو توانای کەسی بەرامبەری نییە ناچار سکاڵاکەی بە گریانەوە دەگەیەنێتە لای دایكو باوکی.

٢- منداڵی شیرەخۆرە زۆردەگری بە تایبەتی لە کاتی نەخۆشیداو لە کاتی برسی بووندا، بێزاری خۆی بە گریان دەردەبڕێ.

٣- هەستانی منداڵ لە خەودا بە تایبەت ئەو کاتانەی کە ئەم منداڵە تێرخەوتن نەبووبێو کەشی خەوتنی تەواو بۆنەڕەخسابێ، بۆیە خەوتنێکی کەم بە خەبەرهاتنی گریان دروست دەکات.

٤- منداڵ ئەو کاتە دەگری کە خەریکی خەوتنە بە تایبەتی نیشانەکانی هەڵگلۆفینی چاوو باوێشك هاتن دەردەبڕێت، بەڵام دایك لە خەوتنی پشتگوێی دەخات.

٥- گەلێ دیاردەش هەیە بۆ گریانی منداڵ لەوانە (سەرمابوون، گەرما، تەڕبوونی جلو بەرگەکانی، خۆپیس کردن، بێتاقەتی، کاتێ منداڵ خەبەری دەبێتەوە بە تەنهایەو کەسی لانییە، کاتێ گوێبیستی دەنگێکی ناخۆشو نەخوازراو بە ئەو دەبێ.

### * لە چ کاتێکدا منداڵ لە ڕادەبەدەر دەگری؟

١- لەو کاتەی کە منداڵ دەگری گوێی پێنادرێت گوێی لێ ڕاناگیرێ تا خواستەکانی جێبەجێ بکرێ، بۆیە تا ئەو کاتە دەگری کە خۆی مەبەستییەتیو بە ئاسانی ژێر نابێتەوە، بەڵام لای هەندێك منداڵ ئەمە پێچەوانە دەبێتەوە.

٢- نەخۆشکەوتنی منداڵو ئازارێکی زۆری جەستەیی کە دایكو باوك ناتوانن لەم ساتو کاتەدا بە خێرایی ئەم گریانەی منداڵ کپبکەنەوە تا چارەسەرنەکرێ.

٣- کۆچکردنو مردنی یەکێك لە ئەندامانی خێزان، کاتێك ئازیزەکانمانماڵئاوایمان لێ دەکەن ئەمەش بۆشاییەکی گەورە لای ئەم منداڵە دروست دەکات.

### * سوودەکانی گریان:

١- دەرچوونی ئێشو ئازار لە جەستە.

٢- گریان بە ڕێژەی نزیکەی ٩٠٪ میزاجی کەسەکان باشتر دەکات.

٣- فرمێسك ڕژێنەکانی چاو گلێنەکانی چاو دەپارێزێت.

٤- سەبووری دەبەخشێتە دڵ، ئاسوودەمان دەکات.

٥- گریان دەربڕینی خەمو خەفەتە کە لە ناوەوە کۆبۆتەوەو هێشتنەوەو خەمو خواردنی لە ناوەوە مرۆڤ توشی نەخۆشی (سایکۆ سۆماتیو گرێ دەروونی) دەکات.

٦- گریان لە پاشەڕۆ ماددەی زیانبەخش ڕزگارمان دەکا.

٧- شتەکانی ناخ هەڵدەڕێژێ.

* چارەسەری گریان:

١- واباشە کە منداڵ گریا سەرەتا بە دوای هۆکاری گریانەکەدا بگەڕێیت، بۆچی دەگری؟ گریانەکەی بۆ چ مەبەستێکە؟ ئایە ڕاستەقینەیە یا دروستکراوی خۆیەتی؟

٢- ئەگەر ڕاستەقینە بوو دایك منداڵەکە لە باوەش بکات، چونکە منداڵ لە باوەشی دایکدا ئارام دەبێ، ئەگەر گریانەکە بە پێچەوانەوە بوو دەبێ دایكو باوك بە دوای ژیرکردنەوەی پراکتیکی منداڵەکەدا بگەڕێن کە پێشوتر تاقیکردنەوەیان لەسەر کردووە.

٣- ئەگەر منداڵەکە (مەلۆتکە) بوو، (لانکە، جۆلانە) باشترین چارەسەرە بۆ ئارامکردنەوەی، بەمەرجێ پەیوەندی بە بواری تەندروستییەوە نەبێت.

٤- منداڵی (٤) مانگە تا (٥) ساڵان کە گریا (سەردانو چوونە دەروو گەشتو سواربوونی ئۆتۆمبیل) باشترین چارەسەرە بۆ لەبیرچوونەوەی گریان، ئەگەر ئەوانەش نە گونجاو دەستەبەر نەکرا کەلو پەلی یاری کردنو خافلاندنی دەبێتە هۆکاری لە بیرچوونەوەی گریانەکە.

٥- کاتی گریانی منداڵ زۆر گرنگە، کە دایكو باوك جێبەجێی بکەن، چونکە ئەمە دەگونجێ تا ڕادەیەك جێگەی هەڵویست بێ بە تایبەتی کاتژمێر (١٢)ی شەو بۆ کاتژمێر (١) دەبێ هەموو شتەکانی بە لاوە بنێین تەنها تەرکیز بکەینە سەر هۆی گریانی منداڵەکە...

٦- هەندێ توێژەرەوەی دەروونزانی منداڵان دەڵێن: گرنگترین شت ئەوەیە کە منداڵ زۆر گریا تەسلیمی نەبیو چۆك بۆ داواکانی دانەدەی ئیتر فێری ئەوە دەبێ گریان باشترین ڕێگەیە بۆ بێزارکردن.

٧- ئەگەر زانیتو بۆت دەرکەوت گریانی منداڵ ماوەدرێژەو بەردەوامەو زۆر دەگری پاداشتی مەکە بە خێرایی ناچار خۆی دێتە سەر ڕێگەی ڕاست.

# دڵسۆزی

ئا: رزگار غەریب

دەگێڕنەوە پاشایەك هەبوو، ئەو پاشایە ڕۆژێك لە ڕۆژان بڕیاری دا گەشتێك بکات بۆ وڵاتێکی دراوسێ، بەڵام یەکێك لە پاسەوانە ئێشکگرەکانی پێی ڕاگەیاند کە خەونێکی ناخۆشی بینیوە، داوای لێکرد سەفەر نەکات، بۆی گێڕایەوە کەوا لە خەونەکەیدا چەند چەتەو ڕێگرێك هێرشت بۆ دەکەن بۆ کوشتنت، پاشاش بۆ ڕاستیو دروستی خەونی پاسەوانەکەی بڕیاری دا لە شوێنی خۆی یەکێك لە وەزیرەکانی بنێرێت، لە ئەنجامدا خەونی پاسەوانەکە هاتەدیو بووە هۆی کوشتنی وەزیرەکە!

دوای گەیاندنی ئەم هەواڵە بە پاشا زۆر نیگەران بوو، هەواڵی نارد بۆئەوەی ئەو پاسەوانەی بۆ بهێنن کەوا خەونەکەی دیتبوو، پاشا بڕیاری دا بە پاداشتکردنیو لە هەمان کاتدا بەسزادانی، پاداشتی کرد لە ڕاستیو دروستی خەونەکەیو دڵسۆزی بۆ پاشاکەی. سزاشی دا لەبەرئەوەی هیچ پاسەوانێك نابێت لە کاتی ئێشکگریدا بخەوێت، بۆیە بڕیاری دا لەسەر کارەکەی لایبدات.

زاهیر زانا

# ئاسایشی دەروونی!!

مرۆڤ بونەوەرێکی زیندووی خاوەن هەستو سۆزو ئەقڵو هۆشە، ئەگەرچی ئەم سیفەتانە هەمووی سیفەتی جیاکەرەوەو جێگەی شانازی مرۆڤنو هەر ئەم تایبەتمەندیانە مرۆڤی کردۆتە گەورەو سەرداری ژیان، بەڵام هەر لەرێگەی ئەم تایبەتمەندیو سیفەتە جیاکەرەوانەوە بەردەوام فشاری دەروونی بۆ دروست دەبێت، ئەویش بە هۆی چەندین هۆکارو سەرچاوەی جیاوازەوە، کە دەبێتە هۆی نیگەرانی مرۆڤو خەوو خۆراکی لێدەشێوێنێتو ژیانی لێ تاڵ دەکات.

بۆئەوەی دەروونمان لە بارودۆخی ئارامیو بەختەوەری دەروونیدا بمێنێتەوە، پێویستمان بە چارەسەرو بەرێوەبردنی فشارە دەروونییەکان هەیە، ئەگەر دەروونی مرۆڤ بچوێنین بە سەتڵێکو فشارە دەروونییەکان بە بەلوعەیەک کە لەسەر سەتڵەکە بێت، ئەوا سەتڵەکە رۆژێک لە رۆژان پڕ دەبێتو ئاوەکەی لەسەر دەرژێت، دەروونی مرۆڤیش بەم چەشنەیە ئەگەر فشارە دەروونییەکان چارەسەر نەکرێن ئەوا رەنگە مرۆڤ رووبەرووی جۆرەها نەخۆشی دەروونی بکەن، تەنانەت بیگەیەننە حاڵەتێک کە بیر لە لەناوبردنی ژیانی خۆی بکاتەوە، فشارەکان لە دوو سەرچاوەوە دروست دەبن: یان خۆمان بۆ خۆمانی دروست دەکەین، یان بەبێ ویستو ئیرادەی خۆمان لە دەوروبەرەوە بۆمان دروست دەبێت، ئەگەر خۆمان بڕیارماندا فشار بۆ خۆمان دروست نەکەین وەك ئەوە وایە بەلوعەکە بگرینەوە.

بۆ چارەسەری ئەو فشارانەش کە لەدەوروبەرەوە بۆمان دروست دەبێت ئەگەر بڕیاربدەین کە بەشێوەیەکی ئاسایی وەریبگرینو لە حەجمو قەبارەی خۆیان گەورەتر بۆیان نەڕوانین، ئەوە وەك ئەوە وایە بەلوعەیەك لەژێر سەتڵەکەدا دروست بکەینو ئەو کاتە هەر ئاوێك بێتە سەتڵەکەوە لەوێوە دەڕواتو دەروونیش لە حاڵەتی ئارامی خۆیدا دەمێنێتەوە.

فشارەکان هەمەجۆرنو کاریگەریەکانیشیان هەمەجۆرەو کەسێك نییە لە دونیادا کە فشاری دەروونی بۆ درووست نەبێت، بەڵام شێوازی مامەڵەکردنمان لەگەڵ فشارەکاندا جیاوازە، پێویستە چارەسەری ئەو فشارانە بکەین کە بۆمان دروست دەبێتو کاریگەریەکانیشیان بە تاڵ بکەینەوە تا ئاسایشی دەروونیمان بپارێزین، بۆ بەرچاو روونی زیاتر چەند جۆرە فشارێك دەخەینە روو:

١- فشاری رۆحی: کاتێك پێویستییە سروشتییەکانی رۆحی مرۆڤ پڕنەکرێتەوە، یان پێچەوانەی ئەو ویستانە مامەڵەبکەین، یا ئەو کاتەی مرۆڤ کارێکی خراپ دەکاتو ویژدانی ئازاری دەدات، یاخود ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێ ناکات، فشارێکی ناوخۆیی بۆ دروست دەبێت.

٢- فشاری کۆمەڵایەتی: کاتێك مرۆڤ لەگەڵ خێزانو کۆمەڵگە ناتەبایەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لە حاڵەتێکی ناتەندروستدایەو هەستو سۆزە کۆمەڵایەتییەکانی لاوازبووەو خۆی بە تاکێکی کۆمەڵگەو کۆمەڵگە بە پشتیوانی خۆی نەزانێت، فشارێکی دەروونی بۆ دروست دەبێتو دووچاری دابڕانو نامۆیی دەبێت.

٣- فشاری ماددی: ئەگەر مرۆڤ نەتوانێت پێداویستییە ماددییەکانی دابین بکاتو سەرچاوەی داراییو دەرامەتی نەبێت، یا دەرامەتی بەشی پێداویستییەکانی نەکات، یا لە ژێر باری قەرزاریدا بێت، یا هەست بە جیاوازی چینایەتی بکات، ئەوا رووبەرووی شڵەژانی دەروونی دەبێتو ئاسایشی دەروونی دەکەوێتە مەترسییەوە.

٤- فشاری جەستەیی: کاتێك مرۆڤ گرفتاری نەخۆشی جەستەیی دەبێتەوەو بەشێکی جەستەیی ئازارو ناتەواوی تێدابێت هەستو نەستو بیرکردنەوەی دووچاری ناتەواوی دەبنەوەو فشاری دەروونی بۆ درووست دەبێتو ناهاوسەنگی دروست دەبێت.

بۆ دەروونێکی ئارامو پارێزگاری لە ئاسایشی دەروونیمان پێویستە بزانین کە ئەوە تەنها ئێمە نین کە کێشەمان هەیە، یا بەشێك لەداواکاریو ئامانجەکانمان نەهاتۆتەدی، بەڵکو دەبێت ئەو بەهرانە بهێنینە بەرچاوی خۆمان کە خوای گەورە پێی بەخشیوینو بەدڵنیاییەوە لەوانە زیاترن کە نیمانن.

پێویستە کێشەو فشارەکان لە چوارچێوەو قەبارەی خۆیان گەورەتر نەکەینو دەروونی خۆمان دووچاری شڵەژانی دەروونیو داروخان نەکەین، چونکە ئەوە کاردانەوەی ئێمەیە گەورەیی رووداوەکان دیاریدەکاتو رەنگە ئەو شتەی یا رووداوەی بۆ کەسێك فشارێکی گەورە دروست دەکات لای کەسێکی تر ئاسایی بێت.

دەبێت بڕوامان وابێت کە کێشەو کۆسپەکان بەشێکی ژیانن، زۆرجاریش دەبنە مایەی خێرو خۆشیو هەمیشە بیرمان بێت کە تا زستان ساردو سەختتر بێت بەهاری رازاوەترو جوانتر دێتە پێش، بڕوابوون بە ئایندەی رووناكو گەشی گوڵی هیوای ژیانمان توانای خۆڕاگرتنی زیاترمان پێدەبەخشێتو کاریگەری رووداوەکان لە سەرمان کەم دەکاتەوە.

بە هیوای دەروونێکی ئارامو ژیانێکی کامەرانو دوور لە فشاری دەروونیو لێوان لێو لە شادیو بەختەوەری.

# ڕازێك لەگەڵ خودادا

یوسف وازەیی

ئەم ڕازەیان قوڵپی ڕۆحەو قوتاربوونە لە دەست جەستە، پاکترین هەناسەی هەستە، لە ڕووناکی ڕووناکترەو لە شەوا نەبێ ناگرێ و مافی ڕەوای پێنادرێ، چونکە ئەبێ (ماڵی دڵت بێ ئەغیار بێو ئەوەی تێیدایە هەر یاربێ)·

هەتاکو ئەنگوستەچاوبێ ئەو باشتر ئەدرەوشێتەوە، تا بێ ڕەشەباو سروەبێ ئەو باشتر ئەگەشێتەوە، تەقینی کانی چاوانەو پاراوی دێبەری گیانە، ئاودێرە بۆ لالەزارو باخە پەژموردەکەی سینە، تروسکەی دیدەو بروسکەی ڕۆحی شەکەتو بێ تینە، هەڵکەنینی ڕەگی ڕژدیو ڕقو قینە، بچووك لە گەورە داخوازیو مەزن لە بچووك پرسینە·

جەژنی ئاشتی لەگەڵ خوداو دۆزینەوەی بەختی خودە· خۆ پاڵدانە حەقیقەتو خۆقاڵدانە لە ئامێزی میهرەبانی میهرەبانان···

دەبێ بەم شەوە دەیجوورە دەست لە ملانی ئەستێرەبی تا لەموحیببەت تێرئەبی، بەستەی تاقانەیی بچڕی، ڕەمزی حەق بکەیتە چەقو لە خولگەی یەکتاپەرستی بە قەدەر تروکەی چاوێ، هەڵوێستەیەك یا هەنگاوێ نەکەویە لادانو سستی·

لەم گۆڕەپانە تارەدا لەم تەنیاییو کەشە کشو بێ چرپەو بێ هاوارەدا، نەبەردیو زۆرانبازییە لەگەڵ نەفسی ئەممارەدا، لەگەڵ ئەم مارە بە ژارو ئافرێنەری پەژارەدا، لەم دەریا پانو پۆڕو بێپایانەدا، لەبەرامبەر پۆلی شەپۆلی ئارەزوو پێچەوانە ڕێکردنە، سەوڵی هەوڵی ڕزگاربوونو ڕوو لە پەروەردگار بوونو بیستنو بەگوێ کردنە·

لە وەنەوز وەڕزبوونو جاڕزبوونە لە باوێشك· لە گەنجینەی عومری خۆگرتنە ئێشك· ژماردنی ترپەی دڵو چرکەی میلی کاتژمێرە، دەستکەوتنی پشکی شێرە، ئای گریانیش هەمووی هەرخەندەیە لێرە، ئەسرین بارانی شادییەو شەستەو ڕەهێڵەی ئاودێرە، بیابانی نە فسی تینوو وشکەڵانی پێ زەنوێرە،

قەرەبووی تەمەنی ڕابردوو تەڕەبوی لە دەستچووە، تێهەڵهێنانەوەی کاتی بە خۆڕاو بێمەبەست چووە···

لەم باخەدا چنینی هێشوی توێشووە، گوزارشتە لە ئایندەو گوزەر لە کاری پێشووە·

ببینە چۆن ئەم شەوگارە بۆتە بۆتەی پاڵفتەی ئەم گیانە کفتەم·

خوداوەندم وا دڵی بە تۆوە بەندم لەسەر لەپی دەست داناوەو بە ئەندازەی تێربوونی ئەو سۆزم دەوێ، پێیەکانم ئەوەندەی لاشەم ڕاگرن، بۆوەی مەشخەڵی دروشمی تۆ هەڵگرن هێزم دەوێ پەروەردگار وا خەریکە دڵی بەردم شووشەی بەختو چارەنووسم ئەشکێنێ، ڕەشەبای هەناسەی ساردم سەوزەڵانو باخی هیوام ئەژاکێنێ، گێژەڵووکەی ئاهی ناخم ژینگەی سنگم لێ پیس ئەکاو درەختی باڵام سیس ئەکاو بەری نۆبەرەو نەگەییوی ئەتەکێنێ···

خودایە لە تەنیاییدا لەگەڵ لێڵی بیناییدا لەگەڵ لاشەیەکی ساردو ڕەنگی زەردو دڵی تەنگو پڕ لە ژەنگوپەنگی دەردو لەگەڵ ئەوپەڕی هەست کردن بە سستیو بێتواناییدا هەمووجەستەم وەك شۆڕەبی ڕوو لەزەوی وەکو سەری سڕم نەوی، ئەوەی تەنیا ڕووی لە تۆیە، ناڵەی دڵو دوودەستمن، دوو لەپی پڕ لە ئومێدو مەبەستمن، نوێنەری ناخو هەستمن، تۆ لە من باشتر ئەزانی خاوەنەکەم بێ هیوا ڕایان ناگرم، بێ وەڵام دایان ناگرم، هەتا ڕشێنەی ڕەحمەتت بۆ دڵەی وەکو ئاگرم، دانەبارێ، تا نەبارێ· هەروەکو جەنگەی بەهارێ، کە هەموو ژوانگەو ئاقارێ سەوز ئەبێ سەوز ئەبم، ئەوسا خامۆشو کز ئەبم···

تاکو بە نمەی چاوانم باخی سینەم پاراونەکەم لێکیان نانێم، هەتاوەکو گیانو دڵم دڵنیا نەبن لە دەستم دایان نانێم·

ئەمشەو تەنها وتووێژی نێوان منو تۆی بەسۆزە··· واهەست ئەکەم، داوەریمان لەسەر ڕەنگی ڕەشی منو شەوقی نوری تۆی پیرۆزە··· وا دەبینم، مامەڵەمان لەسەر بازاڕی جەنجاڵی پڕ لە جاڕی هەرخۆویستیو نادروستی منی پەستو دەستی پڕ لە میهرو هەستی لێبووردنی تۆی کەریمە···

ئاشکرایە·· خانەخوێکەم سفرەی بەهرەو نیعمەتی تۆ ڕاخراوەو ڕانواوە، ئەوەی پێویستە لەسەری دانراوە، منی بێئەمەكو سپڵە زمانم لە سوپاستدا گیرو قفڵە، شەیتانیش بەوەم کەوتۆتە سەماو چەپڵە···!

مەگەر تەنیا چەتری سەترو پۆشینی تۆ بۆ شینی من چارەسەربێ، بۆ داخوازیو کۆشینی من وەڵام دەربێ، مەگەر تەنیا بەزەیی تۆ بزەی من بێ بە نیازی لێبوردنم تا ئەو کۆتە لەگەردنم پێش مردنم دابماڵێ··· چاوەڕێی هێزی لێشاوم هەتا وەکو چڵكو ڕەشی لە دڵی ڕێشو ئێشاوم ڕابماڵێ·

ئیلاهی هەرچەندە کە من لە تۆ دوورم، لەسەر ئەم داوایەم سوورم، هەتا سوورمەی چاوی سوورم لە گەنجینەت دەست ئەکەوێو خەوی غەفڵەتم ئەڕەوێ···

منیش پریشکێ لە تیشکی خۆشەویستیم بەر ئەکەوێ، خۆری هیوام دەرئەکەوێو دەفتەری خواستەکانم بۆ یەکالابێ سکاڵامە، چونکە ئەو تیرۆژە جوانترین کاڵامەو پڕ بە سەرتاپای باڵامە··· کزەو سۆزم نازو گرووی عیرفانییە، چونکە چرای تاقی دڵم کزوخامۆشو بێ نوورەو ناخم تارو قەترانییە··

بۆیە ئەم کرووزەو هاناو پاڕانەوەم هەر تەقەلالای تەجەللاتە، شکاتم بۆ ڕووناکبوونەوەی میشکاتە···!

# سپاردەکان زایە مەکەن!

ڕاز هەڵەبجەیی

ڕۆژێك سەوسـەن گیان کە بە نیازی ڕۆیشتن بـوو بۆ ئەمریـکا سـەرقاڵی خۆئامادەکردن بوو، تەواوی پاشـەکەوتەکەی کە حـەوت ملیۆن تمەن بوو بە منی سپاردو وتی:

نـازی گیـان، ئازیزەکـەم، ئەمـە هەموو پاشەکەوتو سـەروەتو سامانی منە، تۆ تەنها کەسـێکی کە متمانەم پێـی هەبێت، داوات لێ دەکەم ئەم پارەیەم وەکو ئەمانەت بۆ هەڵگری تا دەگەڕێمەوە، بەڵام تکات لێ دەکەم با ئەمە ڕازێك بێت لـە نێوانماندا کەس ئاگاداری ئەم مەسەلەیە نەبێت.

منیش وتم: خەیاڵت ئاسوودە بێت دڵنیابە کە هیچ شتێك بە کەس ناڵێم.

سەوسەن گیان خەسـوم بوو، لەبەرئەوەی کچی نەبوو، وەکو کچـی خۆی ڕەفتاری لەگەڵ من دەکـرد، منیش هەر لە منداڵییەوە دایکمم لە دەست دابوو، سەوسەن گیان جێگای دایکمی بـۆ پـڕ کردبوومـەوە، براکانی هاوسـەرەکەم هەردووکیان سـەڵت بوونو لە ئەمریکا دەژیان، هەر لەبەرئەوە پێشـنیاریان کـرد کە دایکیان بڕواتە لای ئەوانو لـەوێ لەگەڵ ئەواندا بژی، سەوسـەن گیانیش دوای ڕێکخسـتنی کاروباری گەشـتەکەی ڕۆیشـتە ئەمریکا، دوای ڕۆیشتنی ئـەو من زۆر تەنها بووم، بەپێی ئەو پەیمانەی کەپێـم دابوو پارەکانیم لە بانکدا کرد بە ناوی خۆمەوەو هیچیشـم بە کەس نـەوت، تەنانەت هاوسەرەکەشـم (سەفا) ئاگاداری ئەم مەسەلەیە نەبوو، تەنها کەسـێك کە ئاگای لە مەسـەلەکە بـوو (سـەفیە)ی پـورزام بـوو کـە هـەر لە منداڵییەوە پێکەوە گەورە ببووین، دوای مردنی دایکم، پورم سەرپەرشـتی منی دەکرد، هەرگیز جیـاوازی لە نێوانماندا نەدەکرد تەنانەت زۆر کاتیش منی بە سەفیە بانگ دەکرد.

سێ ساڵ تێپەڕی من لەو ماوەیەدا تەنها بە تەلەفۆن پەیوەندیم لەگەڵ سەوسەن گیان هەبوو، هەمووجارێـك دڵنیـام دەکرد کە سـپاردەکەی سـەلامەتە، من هەرگیز لە بیری ئەوەدا نەبووم کە ئەو پارەیە بۆ سـودی خۆشم بەکاربهێنم، تا ئەو ڕۆژەی کە سـەفیە تەلەفۆنـی کرد، نزیکی نیوەڕۆ بـوو من سـەرقاڵی ئامادەکردنی خوانی نیـوەڕۆ بـووم، کـە تەلەفۆنەکە زەنگـی لێدا، سـەفیە لەسـەر خەت بوو بە گریانەوە دەی وت هاوسەرەکەی تووشی کێشەی ماددی بووە بە هۆی چەکێکی ساختەوە خەریکە دەکەوێتە زیندانەوە، گریانەکـەی ئەوەندە بە پەرێشـانەوەبوو کە بە تەواوی کاری کردە سـەر هەسـتو سۆزم، کاتێك لێم پرسی هاوسەرەکەی چەند قەرزارە؟

وتی: بڕی چەکەکە نۆ ملیۆنە، بەڵام دوو ملیـۆن ئامادە کراوەو پێویسـتمان بە حەوت ملیۆنە.

واتە بە تەواوی یەکسان بوو بەو پارەیەی کـە سەوسـەن گیان بـە منی سـپاردبوو! لە بیرکردنـەوەدا بـووم کە سـەفیە وتی: نازی گیـان دەکرێت تـکات لێ بکەم کـە پارەکەی خەسوتم بە قەرز بدەیتێ؟ ئەو خۆ لێرە نییە، پێویسـتی بەو پارەیە نییە، بـەڵام ئێمە بەو پارەیە کێشەکەمان چارەسەر دەکەین، بەڵێنت پێ دەدەم کە زۆر زوو بۆت بگێڕمەوە.

گومانو دوودڵی دای گرتبووم، نەم دەزانی کارێکی باش ئەنجام دەدەم ئەگەر سپاردەکەی سەوسـەن گیانی پێ بدەم یـان نا؟ بە مینگە مینگەوە وتم:

بـەڵام ئاخـر ئـەوە لـە دەسـتی منـدا ئەمانەتـەو..... گریانەکـەی سـەفیە زیاتـر بوو وتـی: توخوا نازی یارمەتیـم بدە، ڕازی مەبە ئابڕومان بچێتو هاوسەرەکەشـم بچێتە زیندانەوە.

ئیـدی چیدی نەمتوانی خـۆم ڕاگرم، بە هێنانەوە بیری هەمـوو ئەو زەحمەتانەی کە پورم لەگەڵمی کێشابوو وتم:

باشـە، بە چاوان، بەڵام دەبێت بەڵێنم پێ بدەیت کە لە زوترین کاتدا بۆم بگەڕێنیتەوەو لە هەمان کاتیشـدا هاوسەرەکەت نەزانێت کە تۆ ئەو پارەیەت لە من وەرگرتووە، دەترسم بە سەفا بڵێتو کارەکە کێشەی تێکەوێت.

لە خۆشیدا هاواری دەکردو لە کاتێکدا کە دەست خۆشی لێ کردم بەڵێنیشی پێدام.

سـێ مانـگ بەسـەر ئـەم مەسـەلەیەدا تێپەڕی، سەفیەو هاوسەرەکەی بە یارمەتی من کێشەکەیان چارەسەر کرد، چاوەڕێی ئەوەبووم کـە پارەکەم بۆ بگێڕنـەوە، بەڵام هەواڵێك لە پارەکە نەبوو!

هەر چیـم دەکـرد ڕووم نـە دەهات کە داوای پارەکـە بکەمـەوە، وام دەزانـی کـە هێشـتا پارەکەیان کۆ نەکردۆتەوەو تا ئێسـتا قەرزەکەیـان نەداوەتەوە، بـەڵام کاتێك چوار مانگـی تریـش تێپـەڕی، زیاتـر نیگەرانیو دڵەراوکێ کەوتە دڵمەوە، ڕۆژێکیان بێ پێشەکی بە سـەفیەم وت ئەویش لە وەڵامدا وتی: بڕوا بکە هێشـتا ئامادە نییە، هـەرکات ئامادەبوو خۆم ئاگادارت دەکەم.

دیسـانیش دانم بە خۆمدا گـرت، ڕۆژان هاتو ڕۆیشت، یەك ساڵ تێپەڕی، بەڵام سەفیە خۆشـی تـێ نەدەگەیاند، بێتاقـەت ببووم بە تایبەت کە زانیم ئـەوان ئۆتۆمبێلێکی مۆدێل بەرزیان کڕیوە، دەمزانی کەسـێك کە قەرزارە پـارەی کڕینی ئۆتۆمبێلی لـەم جۆرەی نییە، تەلەفۆنم بۆ سەفیە کردو ئەمجارە ڕاستەوخۆ ئـاگادارم کرد، بەڵام ئەو بە بێباکانە وتی: تۆ بۆئەوەندە پەلەتە خەسوت خۆ پێویستی بەو پارەیە نییە، بۆ ئەوەندە نیگەرانی؟

ئەوەنـدە توڕەبووم کە هـاوارم کرد: ئەو پارەیە لە دەستی مندا ئەمانەتبوو، تۆ بەڵێنت دا زوو بۆم بگێڕیتەوە، ئێستا ساڵێك تێپەڕیوە تازە دەڵێی پەلەت چییە؟ ئەگەر پارەت هەیە ئۆتۆمبێـل بکـڕی ئەی بـۆ قەرزەکـەی من نادەیتەوە؟

سەفیە دەستی کرد بە دەنگەدەنگو وتی: چیتە بۆ دەنگت بەرز دەکەیتەوە،

## بەڵگەیەکم نیشان بدە کە پارەت بە من داوە!!

لەشم سـاردبوویەوە، تازە تێدەگەشتم کە چ کڵاوێکـم خراوەتە سـەر، بـەو متمانەیەی کە بە سـەفیە بووم، هیچ بەڵێننامەیەکم لێ وەرنەگرتبوو تا بتوانم مافی خۆم بسەلمێنم.

بە بێزارییەوە وتم:

(سەفیە من متمانەم بە تۆ کردو تەنانەت

بـۆ ئـەو پارەیەش هیـچ بەڵگەیەکـم لە تۆ وەرنەگرت، وەڵامـی مەحەببەتو متمانەکەی من ئەمەیە؟!

زۆر بە سـاردییەوە وتی: کەواتە لە خۆڕا مێشکم تێك مەدە، چاوەڕێبە تا خۆم ئاگادارت دەکەم.

دوایش بەبێ خواحافیـزی تەلەفۆنەکەی داخسـت، دوو مانگـی تریـش تێپـەڕی، شـەوێکیان لە ماڵی پورم دەگەڕامەوە، سـەفا بە خۆشحاڵییەوە وتی: کە دایکی دەگەڕێتەوە، بە بیسـتنی ئەم هەواڵە لە جیاتی خۆشحاڵی ئەوەندەی نەمابوو لە هۆش خۆم بچم.

سەفا بە بینینی ڕەنگە پەڕیوەکەی من بە نیگەرانییەوە وتی:

چی بوو؟ بۆ ڕەنگت تێکچوو؟

هەوڵـمـدا خۆم خۆشـحاڵ نیشـان بدەم، وتم:

لـە خۆشـحاڵیدا وام لـێ هـات، کـەی دەگەڕێتەوە؟

سەفا بە پێکەنینەوە وتی:

- بڕیارە دوو هەفتەی دی بگەڕێتەوە....

ئیتـر گوێـم لـە قسـەکانی تـر نەبوو! هەرجۆرێك بوو ئەو شەوەم تێپەڕاند، سبەینێ بەیانیەکـەی دوای چوونـەدەرەوەی سـەفا چووم بۆ ماڵی سـەفیە مەسەلەی هاتنەوەکەی خەسوومم پێ گوتو تکام لێکرد کە یارییەکە تەواو بـکاتو پارەکە بگێڕێتـەوە، بەڵام ئەو دیسـان بـە ڕووداریـیـەوە داوای لێکـردم کە چاوەڕێ بم دەستم کرد بە گریانو بە پاڕانەوە لێـی، داوام لێکرد کە نەهێڵێت ئابڕوم بچێت، سـەفیە نەیدەزانی کە ئەو کارەی ئەو دەبێتە هۆی دڵپیسی هاوسـەرەکەمو دایکیو تەنانەت لەوانەشـە ژیانـم تێك بچێـت، چونکە بە لە خۆبایـی بوونێکەوە وتـی: بەداخەوەم جارێ هیچ کارێکم پێناکرێ.

منیش بە چاوێکی پڕ لە نەفرینەوە سەیرێکم کردو وتم: ئومێدەوارم خوا لەم گوناهەت خۆش نەبێتو باجی ئەم کارەت بدەیت.

سەفیە لەم نەفرینەی من کەوتە لەرزین، ئیتـر چاوەڕێـی هیـچ نەبووەو بـە خێرایی ئەوێم بەجێ هێشت.

ئەو شـەوەی کـە زانیم سەوسـەن گیان دەگەڕێتەوە، یەکسەر نەخۆش کەوتم، سەفای داماو نازانێ مەسەلە چییە منیش ئیتر ناتوانم ڕاسـتییەکە بڵێم، چونکە دەزانم چ کێشەیەك دروسـت دەبێت، بە دڵنیاییەوە سەفا بە هۆی ئەم کارە ناشـیرینەمەوە نامبەخشـێت، تەنیا داوام لەخوا کرد کە تا درەنگ نەبووە سەفییە هەسـت بە هەڵەی خۆی بکاتو سپاردەکەم بۆ بگێڕێتەوە، ئومێدەوارم هیچ کەسـێك توشـی گرفتی لەم جۆرە نەبێت.

سەرچاوە/ گۆڤاری راه زندگی/ ژ. ۲٤۱.

و: بەهمەن لەتیف فەتحوڵڵا

# گفتوگۆیەك لە نێوان پێنووسەو لاستیکدا!

منداڵ بـووەو باپیرەم ئەم چیرۆکەی بۆ دەگێڕامەوە....

لە پەڕاوگەیەکدا، لاستیکێکی بچووکو پێنووسێکی کورتە باڵای جوان هەبوو....

لاستیك: چۆنی هاوڕێم؟

پێنوسـەکە بە توڕەییەوە: هاوڕێی تۆ نیم!

لاستیکەکە بەسەر سوڕماوییەوە: بەڵام بۆچی؟

پێنووس: چونکە ڕقم لێتە.

لاسـتیکەکە بە دڵتەنگییـەوە: بۆچی ڕقت لێمە؟

پێنـووس: چونکـە هەرچـی مـن دەینووسم تۆ دەیسڕیتەوە.

لاسـتیك: بـەڵام من تەنهـا هەڵەکان دەسڕمەوە.

پێنووسـەکە تـووڕە بـوو: جـا ئەوە چ پەیوەندییەکـی بـە تـۆوە هەیـە لـە خۆبایی؟!!

لاسـتیکەکە بە هێمنی وەڵامی دایەوە: من لاستیکمو ئەوەش کاری منە.

پێنووس: ئەمە چ کارێکە!

لاسـتیکەکە ئاوڕێکی لێ دایەوە: کاری من وەك کاری تۆ بەسوودە.

پێنووسـەکە بەمـە زیاتـر تـووڕە بوو پێـی وت: تۆ هەڵەیت، بەڕاسـتی تۆ لەخۆباییت.

لاستیکەکە بەسەرسوڕماوییەوە: بەڵام بۆچی؟!!

پێنووس: چونکە ئەوەی دەنووسـێت باشترە لەوەی دەکوژێنێتەوە.

لاسـتیك: سـڕینەوەی هەڵەکان وەك نووسینی ڕاستییەکان وایە.

پێنووسـەکە ماوەیـەك بێدەنگ بوو، پاشـان سـەری هەڵبڕیو وتی: تۆ ڕاسـت دەکەیت هاوڕێی خۆشەویستم!

لاسـتیکەکە بە دڵێکی خۆشەوە وتی: ئێستا ڕقت لێم نییە؟

پێنووسـەکە بـە هەسـتکردن بـە پەشـیمانییەوە وتی: ڕقم لە کەسێك نییە هەڵەکانم دەسڕێتەوە.

لاسـتیك: دڵنیابـە منیـش هەرگیـز ڕاستییەکان ناسڕمەوە.

پێنووس: هاوڕێی خۆشەویستم، بۆچی دەبینـم ڕۆژ بە ڕۆژ بچـووك دەبیتەوەو قەبارەت کەم دەکات؟

لاسـتیك: چونکە هـەر کات بمەوێت هەڵەی کەسانی تر بسڕمەوە، دەبێت بەشێك لە جەستەی خۆم بکەمە قوربانی.

پێنووسـەکە بە دڵێکـی خەمبارەوە: هەسـت دەکـەم منیش ڕۆژ بـە ڕۆژ باڵام کورت دەبێتەوەو لەناو دەچم!

لاسـتیکەکە دڵنەوایـی کـردو وتـی: ناتوانین سـوود بە کەسانی تر بگەیەنین تا لەو پێناوەدا قوربانی نەدەین.

پێنووسـەکە بـە دڵخۆشـییەوە وتی: بەڕاسـتی تۆ گەورەی هاوڕێکەم، وتەکانت زۆر جوانو شیرینن.

لاستیکەکە دڵخۆش بوو، پێنووسەکەش دڵخۆش بـوو، بۆ هەتا هەتایـە وەك دوو هاوڕێی خۆشەویسـت بە یەکـەوە کاریان دەکـرد، نەلێك جیادەبوونەوەو نە ناکۆکی لە نێوانیاندا دروست دەبوو.

سەرچاوە: ئینتەرنێت.

چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بەڕێز د. ئەفرام محمد حسن پسپۆری نەخۆشییە دەروونیو دەمارییەکان، دکتۆرا لە تەندروستی دەرونیدا سەبارەت بە

خوێندکاران بە گشتیو بە تایبەت خوێندکارانی شەشی ئامادەیی، ترسێکی زۆریان لە تاقیکردنەوەکان هەیە، زۆرجار ئەو ترسە وا دەکات کە بەشداری تاقیکردنەوەکان نەکەن، ئەمەش کێشەی زۆرێك لە خوێندکارانە، بڕیار بۆ وەڵامو چارەسەری ئەم گرفتەی خوێندکاران پێی باش بوو چاوپێکەوتنێك لەگەڵ بەڕێز دکتور ئەفرام، پسپۆری نەخۆشییە دەروونییەکان، ساز بدات، بەڕێزیشی بەوپەڕی لە خۆ بوردنو دڵسۆزانەوە وەڵامی پرسیارەکانی بەم شێوەیە دایەوە:

بڕیار: هۆی چییە خوێندکار لە کاتی تاقیکردنەوەدا توشی ترسو شڵەژان دەبێت؟

دکتور ئەفرام: ئاشکرایە هەموو ڕووبەڕووبونەوەیەكو هەڵسەنگاندنێکی تاك دەبێتە هۆی ئەوەی بڕێك دڵەراوکێ هەبێت، ئەمەش لە هەندێ تاکدا دەگاتە ئاستی ترسو وای لێ دەکات هێندە ترسو شڵەژانی پێوە دیار بێت کە نەتوانێت تاقیکردنەوەکەی بە سەرکەوتوویی ئەنجام بداتو لەم حاڵەتەدا هەردوو هۆکاری دەرونیو گۆڕانکاری جەستەیی کاریگەری هەیە.

گرنگترین هۆکارە دەرونییەکان بریتین لە کەسێتی تاك (بۆ نموونە ئەوانەی خاوەن کەسێتییەکی وەسواسین زیاتر دەترسن وەك لە تاکی ئاسایی)و ئەو ئەزمونو بۆچوونە پێشینەیەی تاك هەیەتی لەمەڕ تاقیکردنەوەو گرنگی ئەو تاقیکردنەوەیە لای تاکو ئەو گۆڕانکاریانەی دروستی دەکات گەر ئەنجامی تاقیکردنەوەکە باش یان خراپ بێت. سەبارەت بە گۆڕانکاری جەستەیی گرنگترینیان گۆڕانکارییە لە ئاستی وەرگرەکانی مێشكو هەروەها گۆڕانکاری لە ئاستی ڕژێنی سەر گورچیلە کە بە هۆی دەردانی مادەی ئەدرینالینەوە دەبێتە هۆی خێرا لێدانی دڵو هەناسە کورتیو دەم وشکبوونو لەرزینو...... هتد.

بڕیار: ئایا شکستخواردن لە ئەزمونەکانی پێشووداو ئەو ترسەی بە منداڵی دەخرێتە دەروونی خوێندکارەوە دەربارەی مامۆستاو تاقیکردنەوە، هۆکارە بۆ دروستبوونی ئەو ترسە؟

دکتۆر ئەفرام: گومانی تێدا نییە یەکێك لە قوتابخانە دەرونییەکان کە قوتابخانەی بافلۆفە زۆر جەخت لە ڕۆڵی فێرکردن دەکاتەوە لە ژیانی تاکدا، دیارە گەر هەوڵ بدرێت تاك هەر لە منداڵییەوە مامۆستاو قوتابخانەی وەکو دوو شتی ترسناك پێ بناسێنرێت، ئەم ترسە لەگەڵیدا گەورە دەبێتو دەبێتە بەشێك لە ڕەفتاری تاك، هەروەها زۆرجار ئەو ترسە لە ئەنجامی ئەو داواکارییە زۆرەوە دەبێت کە باوان یان کەسوکاری خوێندکار لە منداڵەکەیانی داوا دەکەن ئەویش بەردەوام لە ژێر فشاردا دەبێتو ترسی لە سەرنەکەوتن دەبێت، چونکە کاریگەری دەبێت لەسەر هەڵسەنگاندنی دەوروبەر بۆ ئەو، هەروەها دەشێت کەسوکار پەیمانی بەخشین یان هەڕەشەی سزادان لە منداڵەکەیان بکەن ئەمەش فشارێکی ترە لەسەر تاك.

بڕیار: ترس بیرو هزر ژەهراوی دەکات؟ ئەم ژەهراوی بوونە چ کاریگەرییەکی دەبێت؟

دکتۆر ئەفرام: ئەمە ئەرکێکە لە وتە جوانەکان، چونکە ترس وا لە تاك دەکات توانای بیرکردنەوەی لاواز بێتو تەرکیزی کەم بێتەوەو توانای بڕیاردانی دادەبەزێتو ڕاڕاو دوودڵ دەبێت، دیارە ئەمانەش هەموویان کاریگەری ئاشکرایان دەبێت لە ئەنجامی تاقیکردنەوە. هەروەها بەهۆی نیشانە جەستەییەکانەوە وەك دەست لەرزین، خێرالێدانی دڵ، هەناسە تەنگی، دەم وشکبوون، میزەچورکێ، ئازاری گەدەو دڵەکزێ، سوربوونەوە،... هتد، وا لە خوێندکار دەکات نەتوانێت تاقیکردنەوەکە بە باشی بە ئەنجام بگەیەنێت بە تایبەتی تاقیکردنەوەی زارەکی.

بڕیار: خۆ تەڵقینکردن (تێفروسماندن) بە وتەی نێگەتیف یاخود پۆزەتیف هۆکارە بۆ زیادکردن یان کەمکردنەوەی ئەو ترسە؟ ئەو وشانە چین کە هۆکارن بۆ کەمکردنەوەی ئەو ترسە؟

دکتۆر ئەفرام: بەڵێ نەك تەنها بە هۆکارێك دادەنرێت، بەڵکو بە یەکێك لە هۆکارە گرنگەکان دادەنرێت، بۆ زیادکردن یان کەمکردنەوەی ئەو ترسەو تەنانەت یەکێك لە ڕێگەکانی چارەسەر بریتییە لە خۆ تەڵقینکردن (تێفروسماندن) بە پەیڤی پۆزەتیف.

گرنگترین ئەو پەیڤە نەگەتیڤانە بریتین لە:

* ئەم بابەتە زۆر قورسە هەرگیز لێی تێناگەم.

* تازە ئەمساڵ دەرناچم.
* تاقیکردنەوە ناخۆشترین شتە، ناپلیۆنیش لە تاقیکردنەوە ترساوە.
* فلانە مامۆستا پرسیارەکانی زۆر قورسە کەس دەرناچێت.
* بخوێنم و نەخوێنم وەك یەك وایە تازە دەرناچم.

پەیڤە پۆزەتیڤەکان:

* هەموو کەسێك تاقیکردنەوە دەکات و منیش یەکێکم لەوان.
* ئەوانەی پێش من بە هەمان تاقیکردنەوەدا رۆیشتون و تەواویان کردووە، من هیچم لەوان کەمتر نییە.
* بێگومان ئەوانەی دەخوێنن نمرەی باشتر دێنن.

**بڕیار: بوونی ترس لەکاتی ئەنجامدانی تاقیکردنەوە سیفەتێکی خوێندکارە یاخود بەهۆی نەبوونی ئامادەباشییەوە دروست دەبێت؟**

دکتۆر ئەفرام: بەڵێ هەموو خوێندکارێك بڕێك لە تاقیکردنەوە دەترسێت ئەمەش لە خوێندکارێکەوە بۆ خوێندکارێکی تر دەگۆڕێت بە پێی ئامادەباشی و ئەو نمرەیەی چاوەڕێی دەکات و گرنگی تاقیکردنەوەکە لە ژیانی خوێندکارداو فشاری کەسوکارو ئاستی خوێندکار لەو وانەیەدا........ هتد. کەواتە دەتوانین بڵێین هەردوو هۆکار گرنگن، بەڵام لە خوێندکارێکەوە بۆ خوێندکارێکی تر دەگۆڕێت و لە هەمان خوێندکاردا لە کاتێکەوە بۆ کاتێکی تر دەگۆڕێت.

**بڕیار: بە ماوەیەکی کەم پێش تاقیکردنەوە خەوتن هۆکارە بۆ کەمکردنەوەی ئەو ترسە؟ ئەی سەبارەت بە وەرزش کردن؟**

دکتۆر ئەفرام: بە داخەوە خوێندکاری ئێمە لەو باوەڕەدایە گەر شەوی تاقیکردنەوە نەخەوێت ئەوە نمرەی باشتر دێنێت، لە کاتێکدا پێچەوانەی ئەمە راستە چ بۆ کەم کردنەوەی دڵەراوکێ و چ بۆ بواردان بە مێشك بۆ سەیڤکردنی ئەو زانیارییانەی کە وەرتگرتوون.

زۆرگرنگە پێش تاقیکردنەوە بڕێك پشوو بەخۆت بدەیت بەوەی چەند هەناسەیەکی قوڵ هەڵمژیت، یان کەمێك وەرزش بکەیت یان لەگەڵ هاوڕێیەکتدا بدوێیت مەرج نییە لەمەڕ بابەتی تاقیکردنەوە بێت.

وەرزش دەبێتە هۆی جوڵەی پەلەکان و هێوربونەوەی مێشك و دوورکەوتنەوە لە ترس و دڵەراوکێ و چالاکبوونەوە.

**بڕیار: چارەسەری ترسی تاقیکردنەوە؟**

دکتۆر ئەفرام: وەك وتمان روانینە تاقیکردنەوە وەك ئەوەی بەشێکە لە پرۆسەی خوێندن و بەبێ ئەو ناکرێت ئاستی زانستی خوێندکاران بزانرێت، هەندێك خوێندکار هێور دەکاتەوەو گوێ نەگرتن لەو خوێندکارانەی تەنها خەریکی ئەوەن هەواڵی مەترسیدار دەدەنە هاوڕێکانیان (بەخوا کەس دەرناچێ، پرسیارەکان زۆر قورسە، پار لە تاقیکردنەوەی ئەم مامۆستایە تەنها چوار کەس دەرچوو، فلانە خوێندکار چەند زیرەکە پار لەم وانەیەدا ٦٠ی هێنابوو) ئەمانەو دەیەها پەیڤی هاوشێوە کە جگە لە ترساندنی خوێندکار هیچ رۆڵێکی تری نییە.

هەروەها زۆر گرنگە شەوی پێش تاقیکردنەوە خوێندکار پشوی تەواو وەرگرێت و سەر لە بەیانی خواردنی پێویست بخوات گەر هەستی بە ترس کرد، دەکرێت راهێنانەکانی خۆخاوکردنەوە پەیڕەو بکات بە تایبەتی لە شەوی تاقیکردنەوەو ماوەیەك پێش تاقیکردنەوە، بە دڵنیاییەوە هەست بە ئارامی و باوەڕ بەخۆبوون دەکات.

هەروەها هەندێ خوێندکار هەیە لەو کاتەدا بنێشت دەجون، ئەمەش بڕێك لە دڵەراوکێ و ترسەکەیان کەم دەکاتەوەو لە هەمان کاتدا ترشەڵۆکی گەدەش کەم دەکاتەوە.

بڕیار: ئەرکی خوێندکارو کەسوکارو مامۆستا چیە؟

ئەرکی خوێندکار:

* جێبەجێ کردنی ئەرکی رۆژانەی بەبێ دواخستنیان بۆ شەوی تاقیکردنەوە.
* رۆژی پێش تاقیکردنەوە بڕێك ماندوو بوونی زیاتری دەوێ، بەڵام نەك بەو مانایەی خۆت بێبەش کەیت لە خەوو خواردن و پشوودان.
* گوێ لەو خوێندکارانە مەگرە کە تەنها ترس دەخەنە دڵی هاوەڵەکانیانەوە، بە تایبەتی خوێندکارانی دوو ساڵە، لەو بپرسە ئایا سەدەها خوێندکاری هاوڕێی بۆ ئەو قۆناغەیان تەواوکرد بەسەر کەوتوویی، کەواتە گرفت لەو خوێندکارەیە نەك لە وانەکە یان لە مامۆستای وانە بێژ.
* دڵنیابە تۆ هیچت لەوانە کەمتر نییە کە ئێستا خوێندنیان تەواوکردووەو پلەیەکی بەرزیان هەیە، هەروەها لەچاو ئەو خوێندکارانەی کە قۆناغێك لە پێش تۆوەن.
* راهێنانی خۆخاوکردنەوەو پێدانی پەیڤی جوان و هاندەر کاریگەری گەورەی دەبێت لەسەر تواناکانت و کۆمەڵێك توانای شاراوەت دەخاتە کار کە رەنگە خۆت بێ ئاگابیت لێی.

ئەرکی کەسوکار:

* فشار نەخستنە سەر خوێندکار بۆ بەدەست هێنانی نمرەیەك کە زۆر لەسەرو توانای خۆیەتی.
* دابینکردنی کەشێکی ئارام لە ماڵدا بە تایبەتی لەوەرزی تاقیکردنەوەکاندا، (کەمکردنەوەی سەردانی ماڵان و کەمتر پێشوازی کردن لە میوان، کەمکردنەوەی سەیران و گەشتوگوزار)، بەڵام نەك بەو مانایەی کەشێکی ترسناك و پڕ مەترسی سازبدرێت و کەس لە ماڵدا نەتوانێت قسەیەك بکات.
* هاوکاری کردنی خوێندکار چ لە دابینکردنی پێویستییەکانی خوێندنگە، یان کەلوپەلی تایبەتی، تاکو کات بۆ خوێندکار بگەڕێتەوە لە شۆردنی پۆشاك و ئوتوکردن و خواردن ئامادەکردن.
* هەڕەشەنەکردن لە خوێندکار بەوەی گەر نمرەی بەرز نەهێنێت بەوەی فلانەو فلانە سزات دەدەم، بەڵکو هەوڵ بدرێت شێوازی هاندان بەکار بهێنرێت، گەر خوێندکار جارێك نمرەیەکی کەمی هێنا سزا نەدرێت، بەڵکو هەوڵ بدرێت بارودۆخەکەی لا ئاسایی بکرێتەوەو داوای لێبکرێت جاری دووەم تۆڵەی ئەم جارەش بکاتەوە، نەك بە هۆی نمرە کەمەکەوە هەمیشە بە چاوێکی پڕ لە گلەیی و لۆمەکردنەوە سەیر بکرێت.

ئەرکی مامۆستا:

* نەترساندنی خوێندکار بەوەی هەڕەشەیان لێ بکات پرسیاری قورستان بۆ دادەنێم.
* هەندێ یان زۆربەی خوێندکار کاتێك مامۆستا لە نزیکییەوە بووەستێت دەشڵەژێت و ترسی لێدەنیشێت، بۆیە واباشە مامۆستایان سنورێك لە نێوان خۆیان و خوێندکاردا بهێڵنەوە لە کاتی تاقیکردنەوەدا، یان گەر بەسەر خوێندکاراندا گەڕان لای تەنها یەك خوێندکارەوە نەوەستن، بەڵکو زوو زوو شوێنی خۆیان بگۆڕن.
* ئارامی بەخشین بە خوێندکاران پێش تاقیکردنەوە نەك ترساندنیان، ئەویش لەرێی پەیڤە هێورکەرەکانەوە (وەکو ئەوەی خۆی ئامادەکردبێت بەدڵنیاییەوە دەردەچێت، ئەوەی رۆژانە گوێی گرتبێت بێگومان دەردەچێت، پرسیارەکان هیچ قورسی تیا نییە هەر ئەوانەیە کە رۆژانە باسمان کردووە). یان رۆژێك پێش تاقیکردنەوە هەندێ رێنمایی و روونکردنەوە لەسەر شێوازی پرسیارەکان بداتە خوێندکار.

شێخانی

# دوای مردنت پێت خۆشە چۆن باست بکەن؟

وای دابنێ پێش چەند چرکەیەك لەمەوپێش هەموو خزمو دۆستو خۆشەویستانت لە ڕێوڕەسمی بە خاکسپاردنی تۆدا ئامادەبوونو دوای ئەوەی تۆیان بە خاك سپاردو جێیان هێشتیت، بە ڕێگاوە باسی تۆ دەکەن!

چۆن ئارەزوو دەکەیت دوای مردنت باست بکەن؟

دەتەوێت خەڵکی چی بڵێن؟ باسی چی تۆ بکەن؟

چیت پێ خۆشە کە لەوێ باس بکرێت؟

ئایا تا ئێستا ئەم پرسیارانەت لە خۆت کردووە؟

ئەگەر تەنها ساتەکانی ژیانت بە لاوە گرنگەو هیچ حیسابێك بۆ دوای مردنت ناکەیت ئەوا هیچ پێویستیت بەم پرسیارانەو وەڵامەکانیان نییە!!

بەڵام ئەگەر پاشە ڕۆژ بۆ تۆ گرنگەو دەتەوێت دوای خۆت ناوبانگێکی باش جێبهێڵیتو بەو شێوەیەی کە خۆت حەز دەکەیت باسی شوێنەوارە باشەکانت بکەنو جێگای شانازی نەوەکانت بیتو مێژوو لە پەڕە زێڕینەکانیدا ناوت تۆمار بکات، پێویستە ئامادەباشی بۆ ئەو ڕۆژە بکەیت!

هەڵبەت بە دەستکەوتنی ناوو ناوبانگی گەورە لە ژیاندا کارێکی زۆر ساناو ئاسانە، چونکە زۆرن ئەو کەسانەی کە تەنها لەبەر شتێك دراو ئامادەن بە باڵای کورتە باڵایاندا گۆرانی بڵێنو جوانترین نازو گەورەترین پلەوپایەیان پێببەخشنو بە جوانترین شێوە وەسفیان بکەن، بەڵام گرنتییەك نییە کە دوای مردن کەس بە باشە ناویان بەرێو جێگای شانازی بن بۆ دوای خۆیان.

کەواتە چی وا دەکات کە بتوانین لە دوای خۆمان کەسانی دڵسۆز بەوپەڕی خۆشەویستیو چاوی پڕ فرمێسکەوە ماڵاواییمان لێ بکەنو دواتریش بۆ هەمیشە لە دڵی خۆیاندا یادمان بکەن!

ئێمە ئەمڕۆ دەتوانین بەوپەڕی خۆشەویستیو دڵسۆزییەوە لەگەڵ دەوروبەرماندا مامەڵە بکەینو پەیامی خۆشەویستیو دۆستایەتی لە نێوان مرۆڤەکاندا بڵاوبکەینەوە، لەگەڵ خۆشییە کاتییەکاندا پێ بکەنینو لەگەڵ ناخۆشییەکانیشیاندا وانەی ئارامگرتنو ئەزموون فێربین.

دەستێکی نەرم بین بۆ سڕینی فرمێسکەکانیان.

نیگایەکی ڕوون بین بۆ ئەمڕۆو ئایندەیان.

دڵمان دەریایەکی سپی بێتو جێگای خەمو هیوای هەموو مرۆڤەکانی تێدا بێتەوە.

کەواتە با لە خۆمان بپرسین تا ئێستا چەند پرۆژەمان ئەنجامداوە؟

کە ئێستاو سبەینێ جێگای شانازیو دوعای خێرو نەوازشی مرۆڤەکانی دەوروبەرمان بن.

چەند نەمامان چاندووە، تا لە دوای خۆمان ڕێبوارە ماندووەکان لە ژێریدا پشوو بدەن؟

چەند کانیو کارێزمان ئاوەدان کردۆتەوە؟ تا جوتیارە ڕەنجدەرەکان ئارەقی نێوچەوانی خۆیانی پێ بشۆرن!

کرێکارە ماندوو نەناسەکان ڕووخساری تۆزاوی بە سورەتاوی هاوینی پێ فێنك بکەنەوە!

چەند قوتابخانەو دامەزراوەی زانستیمان بە جێهێشتووە؟

چەند کتێبو گۆڤارو بڵاوکراوەمان کردووە بە دیاری بۆ نەوەکانی دوای خۆمان؟

چەند پرۆژەو خزمەتگواریمان دوای خۆمان بە جێهێشتووە تا لە نێو گۆڕەکەدا بە ئاسوودەیی سەر بنێینەوەو لە دوای مردنی خۆشمان لە دڵی هەموو لایەکدا نەمریمان پێ ببەخشرێت؟

ئەو شتانەی ئەمڕۆ دەیان کەین، ئەو شتانەن کە لەسەر گڵکۆکەمان دەبیسترێتو نەوەکانیشمان هەمیشە یادی دەکەنەوە!!